

١٧

# قورئان وەحی ئاسمانە

## نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی

وەڵامێك بۆ كتێبی ( ئایا قورئان ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆیەتی؟ )


نووسینی

بەكر حەمەصدیق



www.tishbooks.com

# قورئان وەحی ئاسمانە

## نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی

وەلامێك بۆ كتێبی (ئایا قورئان ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆیەتی؟)


نووسینی:

بەكر حەمەصدیق


1428كۆچی-2007زایینی

**ناوی کتێب:** قورئان وەحی ئاسمانە نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی، وەڵامێك بۆ کتێبی (ئایا قورئان ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆیەتی؟)

**نووسینی:** بەکر حەمەصدیق

**ژمارەی سپاردن:** (328 ) ساڵی (2007)

**شوێنی چاپ:** کۆمپانیای چاپو پەخشی نووسەر

**نۆرەی چاپ:** یەکەم

**ساڵی چاپ:** 2007

**تیراژ:** 1500

**لە بڵاوکراوەکانی:** پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە ( 17 )

**ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت :** www.tishkbooks.com

**ئیمەیلی پرۆژە:** info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com

## بە ناوی خوای گەورەو میهرەبان

### پێشەکی

لە دێر زەمانەوە تا ئەمڕۆ، مرۆڤ بە بەردەوامیی پرسیاری لەخۆیو دەوروبەری کردووە، دیاردە سرووشتیو نا سرووشتییەکانی دەوروبەری بوونەتە جێگەی پرسیارەکانی، بەڵام بە ئەندازەیەکی زیاتر، ئەو دیاردانەی کە نامۆو کەمتر دووبارە دەبنەوە، زیاتر باری سەرنجی مرۆڤەکانی ڕاکێشاوە. هەڵهاتنی خۆر، بۆ یەکەم بینین پرسیارێکی نوێیە، بەڵام کە دووبارە دەبێتەوە، وردە وردە ئاستی ڕامانی مرۆڤ لەو پرسیارەدا بەرەو فەلسەفەی هەڵهاتنەکە دەڕوات، بەڵام لە دووبارەبوونەوەدا کە لە پڕێکداو وەك دیاردەیەکی نامۆ سەرهەڵدەدەن، مرۆڤ دەخەنە ئەندێشەی پرسیارکردن لەسەر وردو درشتی ئەو دیاردە نامۆیە. سەرهەڵدانی ئایینەکان لەو جۆرە دیاردانەن، پرسیارەکەش لەوێوە سەرهەڵدەدات کە چۆن دەبێ بەم شێوازە خواوەند بە ڕاستەوخۆ، یان وەحی، فەرمایشتی خۆی ئاڕاستەی کەسێك بکات کە سیفەتی (پەیامبەر)ی هەڵگرتووە. بە ئەندازەی مامەڵەکردنی مرۆڤ لەگەڵ ئەم پرسیارەدا، باوەڕدارو بێباوەڕ، بە پەیامی پێغەمبەران پەیدابووە:

لە سەرەتاکانی سەرهەڵدانی (وەحی)دا موشریکان بەناڕەزاییو تووڕەبوونەوە پرسیاریان دەکرد:

1. بۆچی لە هەردوو شارە گەورەکە خواوەند پیاوماقوڵێکی هەڵنەبژارد، بە بۆچوونی ئەوان پیاوماقوڵ ئەو کەسەبوو خانو دیوەخانی هەبێت.

2. بڕوانە ئەو پێغەمبەرە چۆن وەك ئێمە دێتو دەڕوات لەناو بازاڕداو دەخواتو دەخواتەوە؟!

3. بۆچی پێغەمبەر، (فریشتە) یان (پەری) نییە؟

پاش کۆتاییهاتنی ئەم پرسیارانە، پرسیاری تر وەك لێزمە دادەبارین، لەوەش زیاتر پرسیارەکان دەبنە ناڕەزاییو تۆمەتبارکردن، –ئەم پێغەمبەرە ڕاست ناکات، فێی لێهاتووە، جنۆکەو پەری فێ..................ری دەکەن،ش..............اعیرە، جادووگەرە–، کە یەکلادەبێتەوە هیچ یەکێك لەوانە نییە، ئەوجا پێی کافر دەبن، نکوڵی لە سیفەتی پێغەمبەر بوونی دەکەنو دەڵێن گوتەو قسەی خۆیەتی بۆی نووسراوەتەوە. ئەمە چۆنو کەیو لە کوێو کێ فێری کرد؟ وەڵام نییە. ئەم پرسیارانە بۆ هەموو ئەو کەسانەی لەباری دڵڕاوکێو ڕقابەریدا دەژین، بە چەندین شێوازیتر دوویات دەبنەوە، بە ئەندازەی فراوانیی ئاسۆی بیرکردنەوەی مرۆڤەکان، جۆری پرسیارەکانیش گۆڕانیان بەسەردا دێت.

هەموو ئەو پرسیارانەی کە لە سەردەمێکی مێژوییدا ئاڕاستەی هەر پەیامبەرێکی ئاسمانی دەکرێن سرووشتین، بە پرسیارە نامەنتیقییەکانیشەوە، بەڵام پرسیاری ناسرووشتیی ئەو پرسیارەیە کە دوای هەزارو چوارسەد ساڵ، مامۆستایەکی زانکۆ، یان نووسەرێکی خۆبەشتزان، یان سیاسەتمەدارێکی ملهوڕ، بۆ ناشیرینکردنی ئایینێکی مەزنی وەك ئیسلام جارێکی دیکە دووبارەی دەکاتەوە، جیاوازی چییە لەنێوان ئەم دوو پرسیارەدا:

موشریکێك دەپرسێت: ئەم قورئانە لە شیعر دەچێت!

نووسەرێکی عەلمانی کورد دەڵێت: ئەم قورئانە لە شیعرەکانی (ئومەیە)ی کوڕی ئەبی (..صلت)ەوە وەرگیراون!

موشریکێك دەڵێت: پەرییەکان ئەم قورئانەیان فێرکردووە.

نووسەرێکی عەلمانی دەڵێت: خەڵك ئەم قورئانەیان فێری (موحەممەد) کردووە!

لەکاتێکدا هیچ موشریکێك بانگەشەی ئەوەی نەکردووە کە کەسێکی دیکە، لەدەرەوەی (مەککە)، ئەو قورئانەی فێری (موحەممەد) کردبێت، بۆچی؟ چونکە ئەوانە باش دەیانزانی کە موحەممەد (ﷺ) لە ژیانیدا بە ئەندازەی وەرگرتنی ڕستەیەك زانیاری، نەچووەتە دەرەوەی (مەککە)، دەشیانزانی موحەممەد (ﷺ) لەهەموو ژیانیدا دووجار چووەتە دەرەوەی مەککە، یەکەمجار لە تەمەنی (12)ساڵیدا، کاتێ کە لەگەڵ مامیدا بوو، سەفەرەکەی تەواو نەکردو گەڕایەوە مەککە، لەسەر ڕاسپاردەی (بوحەیرا)ی ڕاهیب، دووەم جاریش بۆ مەبەستی بازرگانیی لە تەمەنی (25) ساڵیدا بووە. لەو سەفەرەیدا چاوی بەهیچ کەسێك نەکەوتووە کە دەربارەی ژیانو ڕێوڕەسمو بەرنامەسازییو ئاسمانو زەمین ڕستەیەك زانیاری پێبدات! ئیدیو دەبێ ئەم زانیارییەی لەکوێوە بەدەست هێنابێت؟، لێرەدا مەنتیقی عەقڵ و ڕەوانیی بیرکردنەوەی موشریکە جاهیلو سادەکانی پێش هەزارو چوارسەد ساڵی دووڕگەی عەرەب زاڵ دەبێ بەسەر مەنیقی عەقڵی ئەو کەڵە ڕۆشنبیرانەی

که وەزارتی ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستان بەلێکۆڵەر (مفکر)یان، دەزانێ، موشریکەکان لەوە تێگەیشتن کە ئەو پەیامە لەڕووی تەکنیکی داڕشتن‌و ناوەرۆك‌و تۆکمەیی گوتارو قوڵی بانگەوازەکەوە لە جیهانی شیعرو پەخشان‌و داڕشتنی مرۆڤیی دوورە، بۆیە دەیاندایە پاڵ جنۆکەو پەریان، بەڵام هەندێ لە سیاسی‌و ڕۆشنبیرەکانی کوردستان، بێئاگا لە مێژوو، سیرە، ڕووداوەکان، قورئان، فەرمودەکان، پاش هەزارو چوارسەد ساڵ لە ڕووداوەکانی دابەزینی سرووش(وەحی)، دەڕۆنە دەرەوەی باس‌و خواسەکانی سیرەو مێژوو، شتێك دەڵێن کە لەگەڵ مەنتیقی ڕووداوەکانی سیرەو مێژوو قۆناغە دیارەکانی دابەزینی وەحیدا ناگونجێت.

ئەم پرسیارانە ئەندازەی فیکرو عەقڵی قەڵەمی کورد نین، بەڵکو ڕاگوێزی ڕستە و وشەو پەرەگرافی نووسەری عەرەب و ئەو بەرهەمانەیە کە هەندێکیان بە زمانی فارسی نووسراون. ئەو کەسەی سەیری ئەو بەرهەمە (دژە ئیسلام)انە دەکات بەڕوونیی هەست بەو ڕاستییە دەکات!

پێویستە ڕاستییەکی تریش لەیاد نەکەین، کە بریتییە لە بێئاگایی ئەو نووسەرانە، سەبارەت بە قورئان‌و فەرموودەو سیرەو مێژووی سەرهەڵدانی ڕووداوە ئیسلامییەکان، ئەوانەشیان کە هەندێ زانیاری پێیە لەناو تاریکی بوغزو ڕقی ئایدۆلۆژیادا چاو لە ئاستی ڕاستییەکان دەنووقێنن‌و خەریکی ڕەشکردنەوەی مێژووی پرشنگداری ئیسلامن، بۆ ئەم مەبەستەش هەندێ دام‌ودەزگا ڕەسمی‌و ناڕەسمییەکانی کوردستانیش یارمەتییەکی بێشوماری ئەو نووسەرانە دەدەن! پێموایە کە هەوڵێك لە ئارادایە بۆ ناشیرینکردنی ئیسلام‌و کەسێتی پێغەمبەر (ﷺ) لەبەرچاوی نەوەکانی کوردو جیاکردنەوەی کورد وەك نەتەوەیەکی مسوڵمان، لە مێژووی ئیسلامیی‌و گەلانیتری مسوڵمان، سەرباری ترسناکێتی ئەو هەڵە گەورەیە، ئەمە هەنگاوێکی ژەهراوییەو بە زیانی میللەتی کورد کۆتایی دێت‌و پێویستە کۆتایی پێبێت، پرۆژەی (تیشك) هەروەکو لە بڵاوکراوەکانی تری خۆیدا بڕیاری داوە، بەدیار ئەو بڕیارەوە نەوەستێ کە کۆتایی بە تەمەنی ئەو شاڵاوە دەهێنێ، هەنگاوەکانی ڕەوتی خۆی دەستپێکردووەو خوا یاربێت هیچ یەکێك لەو بڵاوکراوە ژەهراویانە بێ وەڵام نابن، ئومێدەوارین ئەم وەڵامەش مەڵۆیەك بێ بۆ سەر ئەو شارایەو خەرمانی پڕ خێرو بەرەکەتی ئیسلامی پێ دەوڵەمەند بێت.

**بەکر حەمەصدیق**

2006/12/1

## کتێبی ( ئایا قورئان ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆیەتی )

### پێناسەی مەنهەج و ناوەرۆك

### مەنهەجی باسەکە

سەرەتا نووسەری باسەکە بە ناوی (پێویست)ەوە ژمارەی سپاردنی، ژمارە (773)ی ساڵی (2004)ی (وەزارەتی ڕۆشنبیریی)ی پێدراوە، ناوی نووسەرو چاپخانەو شوێنی لەسەر نییە، لانی کەم ئەوەی لەم ڕووەوە لەسەر ئەم کتێبە بگوترێ ئەوەیە کە بە ئاگاداریی و دەستخۆشانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری دەرچووە، نووسەر لە پێشەکی کتێبەکەیدا دەڵێ "پێویستمان بە میتۆدێکی وەها لەبیرکردنەوەدا هەیە کەبچێتە بنج و بنەوانی هەر دیاردەو ڕووداوێك، بە پشتبەستن بە لۆژیکی ئەقڵ و زانستەکان لە هۆ ئەسڵیەکانی بکۆڵێتەوە" (ل1 ئایا قورئان...). لەم دێڕەدا نووسەر ئەوە دەدا بەگوێی خوێنەردا کە پشتبەستن بە لۆژیکی ئەقڵ و زانستەکان و لە ڕوانگەی میتۆدێکی بیرکردنەوەی ساغەوە بۆ ژیان و چەمکەکانی شیتەڵ دەکات!. لەکاتێکدا کە نووسەر بە پاشینەیەکی تیۆری ماتریالیزمی مێژوویی سەرجەم باسەکان شیتەڵ دەکات، کە ئەو شێوازە لێکدانەوەیە، جگە لەوەی وەك تیۆرێکی زانستیی سەیری ناکرێت، بەڵکو دیدێکی فەلسەفیانەی مارکسیستانەیە بۆ ڕووداوەکانی مێژوو. ئێستا لە دنیادا، ئەم تیۆرە حورمەتی زانستیی لە کیسداوە، وەك کۆڵخوزێکی بەرهەمهێنی فەلسەفەی کوشتنی مرۆڤ لە مێژوودا سەیری دەکرێت و بچووکترە لەوەی بتوانێ قسە لەسەر جیهانی (ڕوح)و (دڵ)و (گیان)و (دەروون)و (غەیب)و (ئاسمان)و ....هتد بکات، بە شێوازێکی ڕاستەوخۆ، نووسەر لە هەمان لاپەڕەی کتێبەکەیدا دان بەم ڕاستییەدا دەنێت و دەڵێت: "بۆ خوێندنەوەو هەڵسەنگاندنی هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیی لەمێژوویەکی دیاریی کراودا، پێویستە بگەڕێینەوە بۆ لێکۆڵینەوە لە زەمینەی مادیی و تایبەتمەندییەکانی ئەو مێژووە دیاریکراوەی کە ئەو دیاردەیە تیایدا سەری هەڵداوە..". کاتێ خوێنەر سەرنج لەو دێڕە دەدات وا دەزانێ نووسەر باسی دامەزراندنی (کارگە)، یان (کۆڵخۆز)، یان کێڵگەیەکی کشتوکاڵیی دەکات! ئەم شێوازە لێکدانەوە مادیە لەگەڵ زۆرینەی ئەو سەرچاوانەدا یەکدەگرێتەوە کە نووسەر ئاماژەی پێداون و سەر بەهەمان قوتابخانەی (کۆمۆنیستی) عەقڵ تاریکن و پێیانوایە ئەوەی لەنێوبەندی لێکدانەوەی ئاوەزی ئەوان دەرچوو، ئیدی هیچ ڕاستییەکی تێدا نییە، بۆیە دەستپێکی نووسەر لەسەرەتادا بریتییە لە هانا بردنە بەر (میتۆدی ماتریالیزمی مێژوویی-مادییەتی مێژوویی) بۆ لێکدانەوەی قورئان، هەرچیەکیش بە پێی ئەم میتۆدە. لەژێر ئەو تاقیکردنەوەدا دەرنەچووبێت ماموستا (پێویست) (سفر)ی پێداوە!.

ئەو سەرچاوانەی نووسەر بەکاری هێناون، بە ژمارە، (12) سەرچاوەی کوردیی و (16) سەرچاوەی عەرەبین، لە کۆی سەرچاوە کوردییەکان، تەنها یەك سەرچاوەی باوەڕپێکراویشی تێدا نییە کە وەك سەرچاوە لە کتێبخانەی ئیسلامیی کوردیدا مامەڵەی پێبکرێت، ئیدی سەرچاوەکانی تری هی (کۆمۆنیست)و (کۆنە شیوعی)و (پیرە کۆمۆنیست)و (مونحەریف)ەکانی عەرەبن، کە جگە لەزوخاوهەڵڕشتن بەسەر قورئان و ئیسلام و پێغەمبەردا (ﷺ)، چی دیکەیان بۆ نەماوەتەوە.

سەبارەت بە سەرچاوە عەرەبییەکانیش کورتە سەرنجێك دەخەمەڕوو:

لە پەراوێزی کتێبی (النزعات المادیة فی الإسلام)ی (حسین مروة)و (الدولة والدین)ی (محمد سعید طالب)و (الحریم السیاسی..)ی (فاطمة المرنسي)، پەراوێزی چەند کتێبێکی ئیسلامیی وەرگرتووەو خوێنەری پێچەواشە کردووە، گوایە ئەمانەش لەکۆی سەرچاوەکانی باسەکەی ئەوان، وەك کتێبی (أسباب النزول)ی نیسابوریی کە کاك (پێویست) هەر نازانێ باسی چی دەکات و (منهاج المسلم)ی (أبوبکر الجزائري).

ئەمڕۆکە لەبەرئەوەی بەدواداچوونێکی جیددی نییە بۆ نووسینی ئەو نووسەرانەی کە دژی ئیسلام بابەت دەنووسن. هاوکات لەلایەن حکومەت و هەندێ ناوەندی بڵاوکردنەوەی سەر بەدەسەڵاتەوە ئاسانکاریی و ئامادەباشییان بۆ دەکرێ، بە ئاسانی توانیویانە لەهەرباسێکدا ناوی دەیان سەرچاوەو نووسینی کۆن و نوێ بذووسن و واپیشانی خوێنەری کورد بدەن

كە ئەو سەرچاوە گرنگانەیان بینیوەو بەچاوی ڕەخنەو خوێندنەوەی زانستیەوە سەیریان کردوون. نووسەری ئەم کتێبە ڕووترین نموونەی ئەم ڕاستیەیە کە دەقاودەق پەرەگراف و ڕستەو بگرە وشەکانی (حسين مروة)و (خليل عبدالكريم)و (فاطمة المرنسي)و (فوئاد مەجید میسری)مان بە نرخی (تأليف) بۆ (نقل) دەکات، لەکۆتاییشدا ئەم شەکرە تاڵە دەشکێنێ و پێمان دەڵێ: "ئایەتەکانی قورئان جگە لەوانەی کە گێڕانەوەی ئەفسانەی چیرۆك و بەسەرهاتی کۆنن... لە ماوەی بیست و سێ ساڵی ڕابەرایەتیکردنی بزووتنەوەی دەسەڵاتی ئیسلامدا، لەلایەن موحەممەدی پێغەمبەری ئیسلامەوە داڕێژراون!!" چۆن؟، کەی؟. بە چ شێوەیە؟، کێ چاوی لێی بوو؟، چ سەرچاوەیەك وتی؟، چ ڕیوایەتێك نەقڵی کرد؟، کێ گێڕایەوە؟، بە چ بەڵگەیەك؟ تانوپۆی کتێبەکە نەیتوانیوە وەڵامی ئەم پرسیارە سادانە بداتەوە.

ڕێبازی نووسەر لە باسەکەیدا پێکهاتووە لە شەش بەش، هەربەشێکی باسەکە سەرچاوەو پەراوێزی سەربەخۆی هەیەو پێدەچێ بەچەند قۆناغێك و لە چەند بۆنەیەکی جیاوازدا نووسرابن و لە دواییدا بەم کتێبە کۆکرابنەوە یان لەلایەن چەند کەسێکەوە تەرجەمەکرابن، بەهەرحاڵ سەربووردێکی خێرا دەکەین بەسەر بەشەکاندا:

## بەشی یەکەم:

تایبەت کراوە بە سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلام و زەمینەی سەرهەڵدانی و سەرنجدان لە بواری سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ئایینییداو تیشکێکی خستۆتە سەر مەسەلەی ڕیفۆرمی ئایینیی و پێویستیی سەرهەڵدانی، لەم بەشەدا، نووسەر پێشەکیی دادەنێ بۆ دروستکردنی ئەو بڕوایەی کە -بەپێی بۆچوونی ئەو- موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا (ﷺ) پێش بانگەشەی پێغەمبەرایەتی، کەسێکی ڕەخنەگرو ڕیفۆرمخوازێکی ئایینیی و کۆمەڵایەتی بووە، لە ڕەخنە ناوەرۆکییەکاندا ناڕاستی ئەم بۆچوونە دەخەینە ڕوو:

سەرچاوەکانی ئەم بەشە پێکهاتووە لە چەند نووسراوێك کە ئەوەندە لە بابەتێکی ڕۆژنامەیی سیاسییەوە نزیکن، ئەوەندە مەنهەجێکی تێفکرینی قوڵ نین! جگە لە کتێبی (النزعات المادية في الاسلام)ی (حسين مروه)و (کۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا)ی (فوئاد مەجید میسری)و هیچی تر! لەڕووی مەنهەجەوە دەکرێ متمانە بکەین بەم سەرچاوانە، وەك دوو سەرچاوەی (سیرەناسی)؟ لەکاتێکدا ئەم دوو نووسەرە تا سەرئێسقان دەژەرەوتی ئیسلام و ئیسلامیین!.

پێمواپە لەم ڕووەوە شایەتیی شەیتان بۆ ئادەم (عليه السلام)، چەندە سەنگی هەیە، ئەم دوو سەرچاوەیەش هەر ئەوەندە!، بەڵام سەرباری ئەمەش لەسەر خاڵە گرنگەکانی دەوەستین.

## بەشی دووەم:

لەم بەشەدا نووسەر قسە لەسەر پێناس و پێکهاتی قورئان دەکات و ئاماژە دەکات بە سەرچاوەکانی قورئان، (چونکە پێیوایە کە قورئان لەچەند سەرچاوەیەکی تر وەرگیراوە!) باسێك لە ڕێوڕەسمە ئایینییەکانی پێش ئیسلام دەکات قسە لەسەر نەریت و باوەکانی سەردەمی جاهیلیی عەرەبیی دەکات و لە بابەتێکی عەنتیکەو سەرسوڕهێنەردا باس لە ڕۆڵی یارەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکات لە داڕشتنی ئایەتەکاندا، لەم بەشەدا نووسەر بازێکی نامەنتیقی دەدات بەسەر هەموو پرسەکانی عەرەبی هاوکاتی سەرهەڵدانی ئیسلام و پێیوایە کە جگە لە خودی موحەممەد (ﷺ)، یارەکانی هاوکاریان کردووە لە نووسینەوەو داڕشتنی قورئاندا، دیارە نووسەر پێیوایە (پرسیارە گەورەکەی ئەم سەردەمەی دۆزیوەتەوەو بێئاگا لە ژیاننامەو عەقڵیەت و بیرکردنەوەی هاوەڵان، زانیاری هەڵەو بێبناغەو بی سەرچاوە هەڵدەڕێژێت بەسەر خوێنەردا.

هەر لەم بەشەدا، باس لە پرۆسەی (کۆکردنەوەی قورئان) دەکات، تەنها سەرچاوەش بۆ ئەم مەبەستە بەکاری هێناوە کتێبی (مباحث في علوم القرآن)ی (مناع القطان)ە، ئەویش لە چەند برگەو پەرەگرافێکی کورت و تێهەڵکێشدا، بەشێوازی دەستبڕێری و بەپێی خواستی دڵی خۆی برگەی لێدەرهێناوەو هەندێکی تری لێ وەلاناوە، ئەم شێوازە دەستبڕێریەو تاك سەرچاوەییە بۆ باسێکی هەستیاری وەك (کۆکردنەوەی قورئان)، نەك بابەتیی نییەو بەس، بگرە بێمانایەو هیچ میسداقیەتی نییە، ئیدی سەرچاوەکانی تری بریتیین لە: نووسراوێکی (فاطمة المرنسي) کە ژنە هەڵگەڕاوەیەکی دژە ئیسلامەو (الكتاب المقدس)ی گاورەکان و کتێبەکەی (حسين مروة)یە، لەگەڵ نووسراوەکەی (خليل عبدالكريم) کە بە دژایەتیکردنی قورئان و پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەڵانی ناسراوەو کتێبەکانیشی لە کتێبخانەی ئیسلامیدا نین.

## بەشی سێیەم:

نووسەری (بێ ناوونیشان) ئەم بەشەی تەرخانکردووە بۆ قسەکردن لەسەر ناوەرۆکی دەقەکانی قورئان‌و قسە لەسەر گۆڕینی گوتاری قورئانیی دەکات، لە قۆناغی مەککەوە بۆ قۆناغی مەدینەو مەسەلەکانیش پەیوەست دەکات بەڕووداوە مێژووییەکانی وەك کۆچ‌و دەوڵەتی مەدینەو دەستوورەکەی‌و شەڕەکان. شینێکی کەم وێنە دەکات بۆ جولەکەکانی مەدینەو بە گەلێکی مەزڵومی بێزیان‌و بێگوناهیان دەزانێت، لەم بەشەدا نووسەر دەقەکانی قورئان دەخاتە ناو ڕووداوەکانی مێژوو، مارکسیانە ڕووداوەکانی مێژوو دەکاتە بەرهەمهێنی پرۆسەی لەدایکبوونی دەق‌و (گۆڕینی گوتارەکانی قورئان)یش باشترین بەڵگەکانییەتی.

بێگومان ئەم مەنهەجە بۆ لێکدانەوەی دیاردەکانی ئەودیو سرووشت بە شیتەڵکردنی دیاردەکانی ناو سرووشت، میتۆدێکی مارکسیانەیەو دەمێکە دنیای لێکۆڵینەوەی زانستیی بەجێهێشتووەو ناتوانێ ڕاڤەی مەبەست‌و ڕووداوەکانی مێژوو بکات‌و هەموو لێکدانەوەکانیشی سەبارەت بە دیاردەی (ئایین)و (غەیب)و (گیان)و ماناکانی ئەودیو سرووشت بە هەڵە دەرچوون. لەم باسەشدا نووسەر تووشی هەمان شکستی زانستیی بووەو لە هەگبەی (ماتریالیزمی جەدەلی)دا خەیاڵمان بە نرخی زێڕ پێدەفرۆشێت. سەبارەت بە سەرچاوەکانی ئەم بەشەش جارێکیتر دووپات بوونەتەوەو بوونەتە (حەودەرمانە) بۆ هەموو دەردو بەڵایەك دەست دەدەن!!

## بەشی چوارەم:

لەم بەشدا نووسەر درێژە دەدات بە ناوەرۆکی بەشی سێیەمی باسەکەی‌و قسە لەسەر ڕەنگدانەوەی شێوەکاریی ئیسلام دەکات لەگەڵ دەقەکانی قورئاندا، لە (هەڕەشەو ترساندن)ەوە دەست پێدەکات، (ئەفسانە)و (زەبرو زەنگ)و (جیهاد)و (تیرۆر) لە باسە گرنگەکانییەتی، نووسەر دەڵێ: "لە قورئاندا حەوت جار وشەی تیرۆر بە شێوازی جۆراوجۆر دووپات بوونەتەوە" (ل112 ئایا قورئان ...). لە بابەتەکاندا جارێکی تر دەگەڕێتەوە سەر ئەم باسەو چەواشەیی نووسەر لەم مەسەلەیەشدا ڕوون دەکەمەوە.

دیسان سەرچاوەی (حەودەرمانە) لەم بەشەشدا چەندبارە بوونەتەوە، پەیامی ئەم بەشە پێمان دەڵێ: قورئان کتێبی ئەفسانەو خورافەو حیکایەتی وەرگێردراوی کتێبە ئاسمانییەکانیترە، لەڕووی مەنهەجی بیرکردنەوەشەوە، نووسەر لەبەردەم مەسەلەی (غەیب، ناغەیب، ئاسمان، زەوی)دا گیریخواردووە، لەم کتێبەدا نووسەر بابایەکی بێباوەڕی عەیارە بیست‌و چوارە، کەچی باس لەوە دەکات حیکایەتەکانی قورئان لە (ئاڤێستا)و (تەورات)و (ئینجیل) وەرگیراون. بەڵام پێمان ناڵێ: ئەدی ئەو کتێبانەی تر ئەو باسانەیان لە چ سەرچاوەیەکەوە هێناوە؟، بۆیە پەیامی نووسەر لێرەدا ئەوەیە کە بیسەلمێنێ قورئان داڕێژراوی دەستی مرۆڤە، ئەمەشی بۆ ساغ نەبووەتەوە، هەروەکو بۆ نووسەرانی پێش خۆشی ساغ نەبووەتەوە. ڕاکردنیش بەدوای ئەو پرسە بێهودانەدا جگە لە شەکەتیی‌و گومان‌و نائومێدیی هیچی دیکەی لێناکەوێتەوە.

## بەشی پێنجەم:

نووسەر ئەم بەشەی بۆ (ژن) لە ژێرسایەی (دەسەڵات‌و ئەحکامەکانی قورئان)دا تەرخانکردووە قسە لەسەر چاکسازی کۆمەڵایەتیی‌و زیندەبەچاڵکردنی کچۆڵان‌و بەشەمیراتی ژن‌و لەشفرۆشی کەنیزەك‌و دیاردەی فرەژنیی‌و لێدانی ژنان لەلایەن پیاوانەوە دەکات، پاشان دێتە سەر باس‌وخواسی ژن لە قورئانداو گوتاری نێرینەیەتی لە قورئاندا، پاشان دێتە سەر ژنانی هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)، لەم بەشەدا بە شێوازێکی نائاسایی، نووسەر لە مەنهەجی باسەکەی دەرواتە دەرەوەو لە باسی قورئانەوە دەرواتە سەر مێژوو، ڕووداوەکانی سیرە، لەم بەشەدا دووبارە بوونەوەی سەرچاوەکانی تێپەڕاندووەو سەرچاوەیەکی تری خستۆتە سەر سەرچاوە دووبارەبووەکانی پێشووی‌و کتێبەکەی (عبدالخالق معروف)یشی خستۆتە سەر، بگرە هەرە زۆری ئەم باسەی لەم سەرچاوەیەوە وەرگرتووە. بەهەرحاڵ، ئەو ئازادە لە هێنانی سەرچاوەکانیدا، بەڵام بەم کارە بە تەواوەتی چووتە دەرەوەی باسەکەی خۆی.

## بەشی شەشەم:

نووسەر لەمبەشەدا باسی (داڕشتنی قورئان) دەکات‌و بەدەقێکی مێژوویی ناوی دەبات‌و بە بەرهەمی سەردەمێکی کۆمەڵگای عەرەبی دەزانێ، چەند بەڵگەیەك دەهێنێتەوە بۆ سەلماندنی گریمانەی داڕشتنی قورئان لە زەمینەی کۆمەڵایەتی دوورگەی عەرەبیدا.. ئەم باسە گرنگترین باسەکانی کتێبەکەن‌و ئێمەش بە ئەندازەی گرنگییەکەی گفتوگۆی لەسەر دەکەین.

وەك مەنهەجی باسکردن لە زۆر شوێندا نووسەر چووەتە دەرەوەی باسە سەرەکییەکەی، ئێمە لەو لادانەدا لەگەڵیدا ناڕۆین، مەگەر لەبەر پێویست بوونی ئەو کارە، ئەگەرنا تەنها ئەو باسانە هەڵدەسەنگێنین کە پەیوەستن بە قورئان‌و باسەکانی قورئانەوە.

## لە مەنهەجی باسەکەوە بۆ ناوەڕۆکی کتێبەکە

لەم کتێبەدا (ئایا قورئان ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆیەتی؟) خوێنەر ڕستەو پەرەگرافی نووسەرێکی بەناو (پێویست)ی بەرچاو دەکەوێت، کە هەموو هەوڵێکی بۆ ئیسپاتکردنی نائاسمانیی بوونی قورئانەو بە شێوازێکی ڕاستەوخۆ دەست لە باسەکانی سیرەو مێژوو وەردەدات. بۆ ئەم مەبەستەش پەنای بردووەتە بەر ئەو نووسراوو بەرهەمە فیکریانەی کە بە قەڵەمی چەپ‌و بێباوەڕەکانی عەرەب‌و فارس‌و کورد نووسراون‌و بەشی ئەوەندە حەوسەڵەی تێدا نەبووە کە خۆی ماندوو بکات بە دوای سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی ئیسلامدا، بۆ مەسەلەی ڕووداوەکانی مێژووش، دیسانەوە گەڕاوەتەوە سەر کۆمەڵێ سەرچاوەی گومانلێکراوی دژ، کە وەك بەڵگەی ئیسپات پشتیان پێنابەسترێ، سەرباری ئەوانە نووسەر شێوازێکی شیتەڵکاریی گرتۆتەبەر، کەتەواوی ئەو نووسراوانە پەیڕەوی دەکەن‌و بەشێکە لەمیتۆدی ماتریالیزمی مێژوویی، کە دیدێکی فەلسەفیانەی مارکسیزمە بۆ شیتەڵکردنی دیاردەکانی مێژوو هەموو ئەو گۆڕانکاریانەی کە ڕوودەدەن، بە سوود وەرگرتن لەم میتۆدە، نووسەر چەمکەکانی قورئان‌و دیاردەی (وەحی)و ڕاستیی پێغەمبەرێتی موحەممەد (ﷺ)و ڕووداوو گۆڕانکارییەکان، لێکداوەتەوە.

پەنا بردنە بەر ئەم میتۆدەش دوو هەڵەی گەورەی تێدایە:

1. ئەو میتۆدە توانای لێکدانەوەی چەمکە ئایینیەکانی نییەو هەموو شتەکان بە چاوی ماددە دەبینێت، لە سۆنگەی گۆڕانکارییە مادییەکانەوە سەیری ئایین‌و غەیب‌و مەسەلەکانی ئەودیو سرووشت دەکات، ئەمەش بەتەواوی هەڵەیە، چونکە جیهانی (فیزیك)و (میتافیزیك) یان (ناسووت)و (لاهوت)، یان (غەیب)و (شهادە) یان (دونیا)و (ئاخیرەت)، دوو دنیای لەیەك جیاوازن‌و هیچ کاتێ بە پێوەری دنیا، چەمکەکانی ئاخیرەت شیتەڵ ناکرێت. ئەوە تەنها هەواڵی (وەحی)یە کە وردو درشتی ئەو مەسەلە گرنگانەمان پێدەدات، (وەحی) لە دیدگای ئەو میتۆدەی نووسەرەوە جگە لە دیاردەیەکی دروستکراوو (خورافە)ی عەقڵی مرۆڤ، شتێکی تر نییە، لەبەرچی؟.

لەبەرئەوەی ناتوانێ تەفسیرێکی مەنتیقی بۆ (وەحی) بدات بەدەستەوە. لێرەوە (ڤلادیمیر لینین) دەڵێت: "لە جیاتی ئەوەی بڵێین کە خوا مرۆڤی دروستکردووە، باشتر وایە کە بڵێین مرۆڤ خوای بۆ خۆی دروستکردووە"، ئەم وێنە مادديیە بالاگەردانی میتۆدی کاکی نووسەرە، بە نووسراوەکەی خۆی‌و بردارە مارکسیەکانی هاوڕێیانیشییەوە.

2. مارکسییەکان هەردەم ئەوەیان داوە بەگوێی دنیای دەرەوەی خۆیاندا، کە لێکدانەوەی (ماتریالیزمی دیالەکتیك) تیۆر نییەو ڕاستییەکی زانستییە، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیەو دنیای سەردەمی ئەزموونی زانستیی‌و شۆڕشی گەلان‌و گۆڕانکاری سیاسیی‌و کۆمەڵایەتییەکانیی سەر گۆڕەپانی جیهان، سەلماندی کە تیۆرەی (ماتریالیزمی مێژوویی)، نەك هەر تیۆرێکی زانستیی نییە، بگرە فێڵێکی مێژوویی گەورە بوو بۆ ماوەی حەفتا ساڵ مرۆڤایەتی پێ چەواشە کرا.

ئێستاش پێش گفتوگۆی چڕوپڕ لەسەر باسەکانی کتێبەکە، پوختەی پێناسەیەکی چەمکی (ماتریالیزمی‌و دیالەکتیك) بۆ خوێنەر دەکەم. کە ڕێبازی لێکدانەوەی نووسەرو هەندێ (ڕێبازی چەپ)ی وشکەهەڵاتووی کوردستانە.

**ماددیگەرایی وەك ڕێبازی لێکدانەوەی نووسەر:**

ئەم ڕێبازی بیرکردنەوەیە بەشێکە لە جەدەلێکی فەلسەفیی کۆنتر لە خۆی، کە پەیوەستە بە دیالەکتیکی (فەلسەفەی میسالی هیگڵ)ەوە، بەڵام بە هەڵگەڕاوەیی. بەواتای ئەوەی ماتریالیزمی مێژوویی، یان (ماددیەتی مێژوویی) کە ڕێبازی نووسەرەو پێی وایە: کە جموجۆڵی فیکر لە ڕەنگدانەوەی واقیعی مرۆڤو دەورووبەر شتێکی تر نییە، دەگوازرێتەوەو لە دەماغی مرۆڤدا ئاڵوویر دەکرێت. سەرچاوە (المادية والمثالية في الفلسفة لا38).

ئەم شێوازە لێکدانەوەیە کە دێرێکە لەکۆی تیۆرێکی فیکریی ماددیی، کۆمۆنیستەکان بۆ ماوەی حەفتا ساڵ بە مرۆڤایەتیان ڕاگەیاند کە پوختەو خولاسەی هەرچی فیکرو ماناو ڕەوشتو ئایینو بیروڕاو بۆچوونو بەها باڵاکانی مرۆڤ هەیە، بەرهەمی لێکدانەوەو تێڕامانی واقیعینو وردبوونەوەی مرۆڤن بۆ (دژەوانە)ی ماددە، ئەو بیروڕاو بۆچوونانەی بۆ دروست دەبێت، بەمانایەکی سادەتر، وێناکردنی خواوەند کە بەشێکە لە بیرکردنەوەی ئیمانداران لە مێژووی سەرهەڵدانی ئایینە ئاسمانییەکاندا، بەرهەمی لاوازییو دەستەوسانی مرۆڤە لەبەردەم هێزەکانی سروشتدا، بە ناچاری وای لێدەکات کە لە زەینی خۆیدا وێنەیەك بۆ خوا دابتاشێتو ڕێبازێك دابنێت بۆ شێوازی پەرستنی ئەو خوایە. هاوکات سەرهەڵدانی پێغەمبەران لەمێژوودا بەشێکە لەبەرنامەی ترسی مرۆڤ لە سرووشتو خەمی لە دواڕۆژی، نەبادا لەبەردەم کێشەی نێوان سرووشتو (دژەوانەی)ی ماددەدا بەرگە نەگرێتو لەناو بچێت، بۆ ئەوەی لە خوا نزیك بێتەوە، پەیکەرەکانی نزیك بە خواوەندو چەمکی پیرۆزیی کۆمەڵایەتیی لە چوارچێوەی ئایینیدا بۆ خۆی دادەنێت. بەمشێوەیە ئەم ڕێبازە بەم لێکدانەوە لاوازو شکستو بەستەزمانە، تەفسیری سەرهەڵدانی فیکری هەبوونی خواوەندو ئایینەکانو سەدوبیستو چوار هەزار پێغەمبەرو بیروباوەڕی زیاد لە یەك ملیار مسوڵمانی ئەم سەردەمەی بۆ لێکداینەوە. ئەگەر لەم سەدەی بیستو یەکەدا، ئەم ڕێبازە بە حوکمی ڕۆژگار نەچوایەتە زبڵدانی مێژوو، دەبوایە ئێستا کێ وەك بەشێك لە سەرەتاکانی عەقڵی مرۆڤی سەرەتایی سەیر بکرایە؟، بیروباوەڕی یەك ملیار مسوڵمانی ئەم سەدەیە بەسە بۆ پوچەڵکردنەوەی ئەم ڕێبازە، لەکاتێکدا کە کەسێکی تێدا نییە لە سرووشتو پێکهاتەکانی ماددیگەریی بترسێت، هاوکات ئایین ئەو وێنە ڕواڵەتییە سادەو ساکارە نییە کە کاکی نووسەرو هاوڕێبازانی ئەو بەمشێوازە سادەیە لێی تێگەیشتوون، کە وەڵامی پرسیارەکانی مرۆڤی ئیماندار بێت لەوێدا کۆتایی نایەت کە کاکی نووسەر بەڕەهایی پێمان بڵێ: "موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا (ﷺ) لەئەنجامی ڕامانو وردبوونەوە لە سرووشتو کۆمەڵگا، گەیشتە ئەوەی کە پێویستە قورئان بنووسێتەوەو وێنەیەکی پیرۆز بەباڵای خۆیدا بپۆشێت"!!.

نووسەر لە درێژایی نووسینەکەی کە زۆرتر لە (ئامادەکردن) دەچێت، ئەم میتۆدمان بۆ ڕاڤە دەکات کە چۆن واقیعێکی دژواری دوورگەی عەرەب، پڕ لە دژەوانە، پڕ لە کێشە، بتپەرستن، دواکەوتوویی، بێ شارستانیی، توانی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا بەرهەمبهێنێت، کە لە سەردەمی خۆیدا بە بلیمەتی خۆی توانی مێژوو بگۆڕێت. لێرەدا نووسەر ناتوانێ گەورەیی خواوەندو پێغەمبەرێتی موحەممەد (ﷺ)و جوانی ئایینی ئیسلامو مەراسیمی گۆڕانی مێژوو بچووك بکاتەوە، بەڵام ڕاڤەو لێکدانەوەیەکی تری پێدەبەخشێت، لەژێر ڕۆشنایی تیۆری بەسەرچووی ماتریالیزمی مێژووییدا، بۆ ئەم مەبەستەش دوو ئامانجی هەیە:

1. پشتڕاستکردنەوەی ئەو تیۆرەی خۆی باوەڕی پێیەتی.

2. نەفیکردنی حەقیقەتی پێغەمبەرێتی موحەممەد (ﷺ)، کە پەیوەستە بە دابەزینی وەحی لەلایەن خواوەندەوە بۆ پێغەمبەری ئیسلام، لەو میانەیەشدا هەموو جارێك باس لە بلیمەتیو لێهاتوویی پێغەمبەر (ﷺ)دەکاتو ئەو ڕووداوە مەزنەی کە بریتییە لە دابەزینی (وەحی) بە بەشێك لە بیرکردنەوەو لێزانیی پێغەمبەر(ﷺ) سەیر دەکات. وەك بەرهەمێکی مێژوویی دەستو بیرو عەقڵی مرۆڤێك دەیخوێنێتەوە، نەك وەك مەسەلەیەك پەیوەندی بە ئاسمانەوە هەبێت، ئەمەش هەوڵی سەرەکی نووسەرە لەکتێبەکەیدا.

نووسەر بەشی یەکەمی تەرخان کردووە بۆ (سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلام)و قسە لەسەر باری مێژووییو سیاسییو ئابووریی و کۆمەڵایەتیی دەکاتو، لە باسی (زەمینەی ئایینیدا) دەڵێ: "گەورەترین بتی کەعبە ناوی (الله) بووە، ئەم کەعبەیە دواتر ئیسلام کردی بە کەعبەی خۆی" (لا 11 ئایا قورئان ڕەنگدانەوەی ...). لەم ڕستەیەدا ئاماژەی بۆ هیچ

**کتێبێکی سیرە نەکردووە، لە بابایەکی مارکسی ئەم قسەیەی وەرگرتووە! لە ڕاستیشدا ئەمە ڕاست نییە، لە کتێبەکانی سیرەدا کە لەوانەیە نووسەر ناوی هیچیانی نەبیستبێت وەك سیرەی (إبن هشام، المغازي واقيدي، سیرەی ابن أسحاق، السيرة النبويةی أبی شيبه، الرحيق المختومی مباركفوری، ژیانی پێغەمبەری مەزنی ماموستا پارەزانی)و چەندینی تردا لەم کتێبانەو هەموو کتێبەکانی سیرەدا باسی بتێك نەهاتووە بەناوی (الله)، بتە ناودارەکانی عەرەبی سەردەمی جاهیلی بریتیی بوون لە بتی هۆزەکان، بەم شێوەیە: هۆزی (هذیل و مدرکە) بتەکەیان ناوی (سواع) بوو، هۆزی (کلب) بتەکەیان ناوی (ود) بوو، هۆزی (مدحج) بتی (یغوث)، هۆزی (خیوان) بتی (یعوق)، هۆزی (حمیر) بتی (نسر)یان هەبوو، هۆزی (خزاعة)و (قریش)یش بتی (أساف)و (نائلة)یان دەپەرست، (مناة)یش لەسەرکەناری دەریابوو، هەموو عەرەب بەگەورەیان دەزانی بەتایبەتی (أوس و خزرج)، بتی (لات)یش لای هۆزی (ثقیف) بوو، بتی (عزی)ش لە (ذات عرق) بوو، ئەم بتە بتی هەرە گەورەی (قریش) بوو[1]. ئەگەر زانیاری بەمشێوەیە ورد لەسەر بتەکانی دوورگەی عەرەبی گەیشتبێتە دەست خەڵك و نووسەرانی سیرە، چۆن بتێك ناوی (الله) بێت ناوی لە هیچ سەرچاوەیەکدا نابێت؟، بەڕاستی درۆیەکی شاخدارو بێبناغەیە، پێشتر ئەوان بۆ هەربتێك وشەی (إله)یان بەکاردەهێنا بەمانای (پەرستراو)، گومانی تێدا نییە کە وشەی (الله) جل جلاله، لەگەڵ (إله)دا لەڕووی زمان و زاراوەوە جیاوازیان زۆرە، هەر لەسەرەتاوە نووسەر زانیاری ناڕاست و بێبناغەمان لەسەر سیرە پێدەدات، هاوکات ڕەوایە کە ئەم پرسیارە لە کاکی نووسەر بکەین، لە چ سەرچاوەیەکدا ئەو زانیاریە مەزنەت دەرهێنا؟ وەڵام نییە، لەهەموو کتێبە (صحیح)ەکانی فەرموودەشدا ناوی وەها بۆ (بت) نەهاتووە، لێرەوە ئیدی دەبێ خوێنەر بزانێ کە لەگەڵ چ جۆرە نووسەرێکی شارەزادا مامەڵە دەکات.**

**نووسەر لە لاپەڕە (11و 12)ی کتێبەکەیدا چەند ڕستەیەك دەڵێ، لەوانە:**

**. ئەم کەعبەیە دواتر ئیسلام کردی بە کەعبەی خۆی.**

**. بەردەڕەشەکەش لەپێش ئیسلامەوە لای خەڵکی حیجاز پیرۆز بوو.**

**. زیارەتی خەڵك بۆ بازرگانی و زیارەتی بتەکانی کەعبە، بە(حەج) ناوبراوە.**

**. هەموو ڕێوڕەسمەکانی حەج، عەمرە، دەستدان لەبەردەڕەشەکە، هاتوچۆی سەفاو مەرەو ..هتد. تەنها تۆزێك گۆڕان لە حەجی ئیسلامدا ڕوویداوە لە عەرەبی بەر لە ئیسلام (لبیك یا عزی)و (لبیك یا منات)یان دەوتەوە، ئیسلام کردی بە (لبیك اللهم لبیك) (تەواو).**

**سەربارى ناڕاستی ئەو قسانە، سەیرو سەمەرەتر ئەوەیە نووسەر ئەم چەند دێڕەی لە نووسەری مارکسیست (عەلی دەشتی)ەوە هێناوە، کە ئەویش بۆخۆی بە گەواڵە قسەی پڕوپوچی بۆ پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) هەڵبەستووە[2].**

**سەبارەت بە ڕستەکانی (پێویست)یش دەڵێم:**

**کەعبە ڕووگەی یەکتاپەرستانی مێژووە، شوێنێکی پیرۆزەو پێگەی کۆچ و ڕەوی پێغەمبەرانی خودا بووە (علیهم السلام)، کە سەرداریان ئیبراهیمە (علیه السلام)و بە دەستی پیرۆزی خۆی و ئیسماعیلی پێغەمبەر (علیه السلام) دروستکراوە لەو دۆخەوە ئەو کەعبەیە لە ئامێزی نزاکەی ئیبراهیم (علیه السلام)، لەلایەن هەموو باوەڕدارانی دنیاوە بە پیرۆزو ڕووگەی ئایینی سەیر دەکرێت. قورئان ئەم ڕاستیەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بڕوانە سورەتی (ابراهیم) ئایەتی (37–40) (ربنا إني أسكنت من ذريتي بواد ذي زرع عند بيتك المحرم، ربنا ليقيموا الصلاة فاجعل أفئدة من الناس تهوي إليهم وارزقهم من الثمرات لعلهم يشكرون* ربنا إنك تعلم مانخفي وما نعلن ومايخفى على الله من شيء في الارض ولا في السماء* الحمدلله الذي وهب لي على الكبر اسماعيل واسحاق إن ربي لسميع الدعاء) واتە: (پەروەردگارم، من خۆم و ڕۆڵەزاکانم نیشتەجێکرد لە شوێنێکی بێ دەغڵی کرکدا، بەتەنیشت ماڵە حەرامکراوەکەی تۆوە، پەروەردگار، نزات لادەکەم تا نوێژەکانیان بکەن، دڵانی خەڵك کەمەندکێشی لای ئەوان بکەو لەبەروبوومەکان ڕۆزیان بدە، سا بەڵکو سوپاس بکەن.**

[1] (السيرة النبوية، ابن شهبة) 1–51، السيرة النبوية (د.علی محمد الصلابي) ل22 کتێبی (الرحيق المختوم) مباركفوري، وەرگێڕانی بەکر حەمەصدیق ل32، کتێبی (ژیانی پێغەمبەری مەزن (ﷺ) نووسینی ماموستا عەبدولعەزیز پارەزانی ل99، لێکۆڵینەوەی فەرموودەکانی، ڕزگار کەریم).

[2] خواوەند یاربێ، ئەم کتێبەش لە داهاتوودا بەر نەشتەری ڕەخنەی پڕۆژەی تیشك دەکەوێت و درۆ مێژووییەکانی ئەویش دەخەینەڕوو.

پەروەردگاری ئێمە، تۆ دەزانی کە چیمان حەشارداوەو چی ئاشکرا دەکەین، لە ئاسمان‌و زەویشدا هیچ شتێ لە خواوەند ون نابێت، سوپاس بۆ ئەو خواوەندەی بەم تەمەنە زۆرەوە ئیسماعیل‌و ئیسحاقی پێبەخشیم، بەڕاستی پەروەردگارم بیسەری نزاکانە).

خوداوەند ئەم پاڕانەوە تەنهاییەی لە شیوێکی چۆڵ‌و کرک‌و بێدەغڵ‌و دان‌و لە پەنهانییەکی پڕ لە پێدەنگیدا بۆ ئێمە تۆمارکردووە، کە نزای دڵ‌و زمانی باوکی پێغەمبەران‌و پاڵەوانی یەکخواپەرستییە لە مێژوودا، ئەم ئایەتانە مەککەیین‌و لە زەمەنێکدا دابەزیون پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) لەو دەمەدا هێشتا جولەکەو دونیای جولەکەی نەدیوەو نەناسیوە. ئەم هەواڵە جگە لە ئاسمان سەرچاوەیەکی تر بەمشێوەیە پڕ لە شیکاری دڵ‌و دەروونە، باس لە ڕازو نیازی ناخی ئیبراهیم پێغەمبەر (ﷺ) بکات لەگەڵ خواوەندی گەورە، ئەم تێکستە قورئانیە نەك وەکو هەواڵ شتێکی سەیری هێناوە، بەڵکو وەك دەقێکی پڕ لە ئاوازی موزیکی قەشەنگ‌و خوێندنەوەیەکی پڕاوپڕی چەمکی نزای پێغەمبەرێك، ئەوەندە بەرزە مەگەر عارفانی ڕێگەی خودا، مەگەرنا مەحاڵە مرۆڤی ئاسایی بتوانێ بە پەیژەی ئەو مەلەکوتەدا سەربکەوێ، ئەگەر نووسەرێکی وەك (پێویست) وتەیەکی هەیە لەسەر بنەمای مێژوویی‌و شیتەڵی دەروونیی‌و عیرفانیی ئەم دەقە، با بیڵێت، ئەگەرنا بێدەنگیی بۆ ئەو شکۆدارترە!، ئەمە مایەی شەرمە بۆ مرۆڤێکی خوێندەواری ئەمڕۆ کەسێك پێیوابێ ئەمە تێکستێکی خوازراوە، ئەم گوتەیە جگە لە قسەی بێبناغە، لە هەموو دەقەکانی جولەکەدا چاوت بە تێکستێك ناکەوێت بەم مانا قوڵە قسە لەسەر عیبادەت بکات،[1] ، ئەم دەقە، نەك بۆ دنیای جولەکە، بگرە تا هاتنی پێغەمبەری ئیسلامیش ئەم شێوە پەرستنە لەناو عەرەبدا نامۆ بووە، بۆیە تۆمەتبارکردنی پێغەمبەری ئیسلام بە وەرگرتنی ئەم تێکستە لە کتێبەکانی جوو، بە یەکێك لەم گریمانانە دەبێ:

گریمانەی یەکەم: ئایینی جوو هەتا ئەو کاتەو دەیان سەدەی دوای ئەویش بە (عیبری)و (سریانی) نووسراون‌و لە ژیانی پێغەمبەری ئیسلامدا (ﷺ) کیتابی پیرۆزی جولەکە لەناو مەککەو دەوروبەریدا نەبووە، ئیدی چۆن ئەو پەیوەندییە دروست بوو؟!.

گریمانەی دووەم: لە حاڵەتی گریمانەی ئەوەدا کە ئەو کتێبە پیرۆزەی جولەکە لە مەککەدا هەبووبێ، کۆمەڵێ پرسیاری بێ وەڵام دێنە پێشەوە، بە چ زمانێك بووە؟، باسی چی دەکات؟، ئایا لە چ شوێنێکدا باس لەم دیمەنە دەکات؟، ڕەمزەکانی زانایانی جولەکەی ناو مەککە کێ بوون؟، کێ ئەم زانیاریانەی فێری موحەممەد (ﷺ) کرد؟ چۆن؟، کەی؟، لە کوێ؟، ئەمانە وەڵامیان نییە. بۆیە ئەم تۆمەتە جگە لە خۆو خەڵك چەواشەکردن شتێکی دیکەی تێدا نییە.

چیدی...؟

ماوە بڵێین کە دەربارەی باسکردنەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەرانی پێشین بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) لەوانی وەرگرتووە، بەڵکو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئایینی ئیسلام‌و ئایینەکانیتر لەیەك چاوگەوە ڕێچکەیان بەستووە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە مەنهەجی نووسینی (پێویست) لێرەدا پشت بە دنیاگەرییەك دەبەستێ کە باوەڕبوون بەخواوەندو پەیامی پێغەمبەران (علیهم السلام) جێگەی نابێتەوە، ئەم کێشە مەنهەجیە تاکو کۆتایی باسەکەی (پێویست) بەردەوامە.

بۆ زانیاری خوێنەری بەڕێز، باس‌و بەسەرهاتی پێغەمبەران‌و گەلەکانیان بەبەردەوامی لە سورەتەکانی قورئاندا دووبارەو سێ بارە بوونەتەوەو بەوردیش باسیان لێوە کراوە، سەرجەم ئەو باسانەش لەڕووی مەنهەجی باس‌و ناوەڕۆکەوە جیاوازیی گەورەیان هەیە لەگەڵ گێڕانەوەکانی تەورات‌و ئینجیلدا.

نووسەر بۆ ئیسپاتکردنی بانگەشە لاوازەکانی خۆی، دووبارەبوونەوەی ڕەمزو هێماو ناوەکان بەنموونە دەهێنێتەوە.. ئەو ناوانە تەمەنیان چوار هەزار ساڵ دەبێ، چ ئازایەتی‌و ئافراندنێکی تێدایە کە مرۆڤ باس لەو ناوانە بکات، لە چەندین بۆنەی جیاوازدا خودای گەورە لە قورئاندا باسی لە پێغەمبەرانی پێشین‌و ئەم پەیامەو پێغەمبەرەکەی کردووە (ﷺ)و

[1] د. علي محمد الصلابي، السيرة النبوية، دار المعرفة، بيروت، لبنان 2006، لا 73.

بەتەواوکەری یەکتری ئەژماری کردوون، ئەم مەسەلەیە بۆ ئیسلام خاڵی بەهێزە، نەك لاوازیی. بە فەرمانی پەروەردگار، کەعبەی پیرۆز بە دەستو پەنجەو هێزی ئیبراهیمو کوڕەکەی دروست دەکرێتو لەکاتێکی پەنهانو لە حزوری خواوەندی گەورەدا ئیبراهیم (علیه السلام) لە خوا دەپاڕێتەوە کە لەم خاکە بێ پیتو وشكو بێ دەغڵو چۆڵەدا، دڵی خەڵکان کەمەنکێشی خاکی حیجاز بکاتو کەعبەش پیرۆز بکات. بەرەکەتو پیرۆزیی ئەو نزایە هەتا ئەوڕۆکە دیارە، لە هەموو گۆشەو قوژبنێکی دونیاوە خەڵك ڕوودەکەنە ئەوێ بۆ خودا پەرستی (وأذن في الناس بالحج يأتوك رجالا وعلى كل ضامر يأتين من كل فج عميق) (الحج) واتە: ئەی ئیبراهیم، لەناو خەڵکیدا بانگ بدە بۆ حەجکردن بەرەو ماڵی خودا، دەبینی کە لەدوورو نزیکەوە بەپیادەو بە سواری وشتری لاوازەوە خەڵك دێنە ئەم شوێنە"، ئەگەر (پێویست)و هەرکەسێکی تری وەك ئەو، لە ساتەوەختی ئەم ڕازو نیازەی خوداوەندو پێغەمبەرەکەی ئیبراهیم (علیه السلام) ئامادەبوونایە، وەك مەسەلەیەکی نامەنتیقی مامەڵەیان لەگەڵ دوعاکەی ئیبراهیمدا دەکرد، چونکە جگە لە چەمکی خواپەرستیی‌و غەیبیانەت. بە هیچ مانایەك عەقڵی مرۆڤ ناتوانێ ئەو ڕاستییە شیتەڵ بکات، کە هەتا ئەمڕۆ لە ئارادایەو بە ملیۆنان مرۆڤی سەرزەمین هەموو ساڵێك بەدەم وتنی (لبيك اللهم لبيك)ەوە دەڕۆنە ماڵی خوداو حەج دەکەن!!.

(پێویست) دەڵی: "مەراسیمەکانی حەج لە پێش ئیسلامیشدا بەمشێوازەی ئێستا بوونو ئیسلام کردوونی بەهی خۆی، هەورەها وشەی (حەج)ی وەك خۆی هێشتەوە". بێگومان کە مەراسیمەکانی حەج لە پێش ئیسلامدا بەمشێوازە نەبوون، وشەی (حج)یش کەوەك خۆی ماوەتەوە، ڕاستە، بەڵام شێوازو ناوەرۆکی حەج گۆڕانی سەرانسەریی بەسەردا هاتووە، ئەو بەشەی مەراسیمی حەج کە هەبووە، پاش ئەوەی هەڵسوکەوتی (حەنیفیەت) بووەو بە هاتنی ئایینی ئیسلام ڕاستکراوەتەوەو شەقڵی خۆی وەرگرتووە.

لە لاپەڕە (12)دا (پێویست) دەڵێ: "بیرکردنەوە لە هێزو دەسەڵاتو تووڕەبوونی خوداکان، ترسێکی ئەوتۆی لەلا دروستکردبوون، کە جگە لە تەسلیم بوون، هیچ چارەیەکیان لەبەردەم خۆیاندا نەهێشتەوە، بە ناچار کەوتنە پاڕانەوەو پەرستنو سوژدەبردن، بتەکانیشیان بۆیە دروستدەکردو دەچوونە زیارەتیان، تا بە هۆی ئەوانەوە لەخوداکان نزیك ببنەوە. لە بتەکان دەپاڕانەوە، تا داوایان لێدەکردن تا خوداکان لەهەڕەشەو مەترسیو بەڵاکانی ژیانیان بیانپارێزن، پێیان وابوو کە بتەکان نوێنەری خوداکانی ئاسمانن" (ل12 ئایا قورئان...).

ئەم قسەیەی پێویست لەڕووی مەنهەجەوە، سەرچاوە لەو بیرۆکە مارکسیانەوە وەردەگرێت کە پێی وایە (ماتریاڵ–مادده) بەهەمێتی فیکرو بیرکردنەوەی مرۆڤە. مرۆڤ بەردەوام لە ململانێی بەردەوامدایە لەگەڵ سروشت، بۆیە مرۆڤ چەند لە هێزی سروشت بترسێ، ئەوەندە خواو شتی ئەفسانە بۆ خۆی دادەتاشێ... ئەم میتۆدەی مارکسیزم هەڵەیەکی گەورەیە لە دانانی بناغەی بیرکردنەوەی مرۆڤدا، ئەگەر ئەو بیرۆکەیە ڕاست بێ، تەنها ئەوەندە هەناسەی تێدایە کە باس لە مرۆڤی ناو ئەشکەوتێك بکەیت کە جگە لە بارانو هەورەب روسکەو ئاژەڵ هیچی تری نەبینیبێت. لەو جۆرە ترسەی مارکسییەکان باسی لێوە دەکەن، هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بە مرۆڤی خوێندەوارو بیرمەندو ڕۆشنبیرەوە نییە کە هەزارانیان ئیماندارنو لە هێزە گەردوونییەکانی وەك هەورە بروسکەو بارانو شەوەزەنگ ناترسن. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە، ئایینەکان تەنها باسیان لە ترس نەکردووە، بەڵکو باسیان لە وادەو بەڵێنە خۆشنوودەکانیش کردووە، کە خواوەند لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە (علیهم السلام) بە مرۆڤەکانی ڕاگەیاندووە. لەمانەش زیاتر، ئایینەکان تەنها تەفسیری مەسەلە غەیبەییەکانیان نەکردووە، بەڵکو فۆڕمێکی نوێی بەرنامەی ژیانیان پێبووە، کە هەموو (مفردە)و چەمکەکانی سەردەمی خۆی خستۆتە ژێر پرسیارو ڕەخنەی خۆیەوە، ئەی ئەم برادەرەی لەمەڕ خۆمان لەم بارەیەوە چی دەڵێ؟!!.

سەرباری ئەمانە، لەو پەرەگرافەدا نووسەر بە کەرەستەیەکی ئایینی بی تفاقو لاواز قسە دەکات، بۆ نموونە هەموو عەرەب لە دووگەی عەرەبیدا باوەڕیان وابوو کە یەك پەروەردگار هەیە کە ئاسمانەکانو زەمینی دروستکردووە، کە چی نووسەر باس لەخوداگەلی ئاسمان دەکات. ئەم چەمکە لە هیچ کتێبێکی مێژوویی ئایینیدا باسی نەهاتووە، هەموو بتەکانیشیان بۆ نزیکبوونەوەی خۆیان لەو تەنها خودایە پەرستوە، ئەمەیە ئیشکالیەتی شیرك لەدووگەی عەرەبییدا، نەك ئەوەی (پێویست) نووسیویەتیو بێئاگایانە لە (حسين مروة)ی وەرگرتووە، کە نووسەرێکی مارکسیەو پەیوەندی بە

ئیسلامەوە نییە، هاوکات پەرەگرافەکەی پێشووتریشی لە (عەلی دەشتی) وەرگرتووە، کە نووسەرێکی کۆمۆنیستیی دەمارگیریی دژ بە ئیسلامەو بە ئەندازەی دنیایەك، هەڵەو بێشەرمیی بەرامبەر بە پێغەمبەری ئیسلام کردووە، ئایا هەق نییە کە خوێنەر بپرسێت ئەرێ کاکی (پێویست)، نەدەبوو کەمێ قورئان و تۆزقاڵێ فەرموودە بخوێنیتەوە بۆ ئەوەی هیچ نەبێ هەڵەی وا زەق و گەورە نەکەیت؟!.

لەڕاستیشدا کێشەی عەقیدەیی (شیرك)، لەناو دوورگەی عەرەبییدا، دوورە لەو لێکدانەوەیەی کە (پێویست) باسی دەکات، (پێویست) لەبەرئەوەی هۆشیاریی باشی پێنییە سەبارەت بە ڕووداوەکانی دوورگەی عەرەبی لە سەردەمی جاهیلیەتدا، دوای ئەوەش ئاگادار نییە لە کرۆکی ئەو ڕەخنەیەی پەیامی ئیسلامەتیی ئاڕاستەی (بت)و (بتخانە)و (بتپەرست)و (عەقیدەی بتپەرستی) کردووە، هەڵەیەکی گەورەو زەق دەکات و ئاماژە بۆ (خواگەل)ی ئاسمان دەکات.

بۆ ڕاستکردنەوەی زانیارییەکانی نووسەرو هەر کەسێکی دیکە، پێویستە ئەم ڕاستییە بڵێم، کە موشریکەکانی عەرەب باوەڕیان هەبووە کەیەك خودا لە ئاسماندا هەیە، بەڵام فەلسەفەی دانانی بتەکان لەوەدا بووە کە موشریکەکان ناوی بتەکانیان لەناوی پیاوچاك و خێرخوازەکانی مێژوو پێش خۆیان وەرگرتووەو پێیان وابووە ڕۆحی ئەم پیاوچاکانە لەخواوەندیان نزیك دەکاتەوە، قورئانی پیرۆز لەم بارەیەوە فەرموویەتی (لئن سألتهم من خلق السموات والارض ليقولون الله) (العنکبوت 61) هەروەها کە پرسیاریان لێدەکرا، بۆچی ئەم بتانەتان بۆ خودا داتاشیوە، لە وەڵامدا دەیانوت (مانعبدهم الا ليقربونا الى الله زلفى) (الزمر 3) واتە: بۆ ئەوەی لە خواوەند نزیکمان بکەنەوە.

ئیسلام لێرەوە تواناو دەسەڵات و هێزو لێهاتنی بتەکانی خستە ژێر پرسیارو بە کەفتەکارو بێدەسەڵات ناوزەدی کردن و تواناو دەسەڵاتەکانی دەگێڕایەوە دەست خواوەندی تاقانە. ئەمەش بەموشریکەکان قبوڵ نەدەکرا. بۆیە دژ بە ئیسلام دەوەستانەوە. دژایەتی کردنی موشریکەکانیش بۆ پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ)و پەیامەکەی پەیوەندیی زۆری بەم مەسەلەیەوە هەبووە، چونکە (شیرك) بۆ عەرەبی دوورگە، سەرباری ڕەگ و ڕیشە داکوتانی لە ناخی خەڵکدا، چەند مانایەکی تری هەبوو:

1. مانایەکی کۆمەڵایەتیی: هەموو هۆزو تیرەکانی دوورگە، لەناو کەعبەو دەرەوەیدا بتی تایبەتیی خۆیان هەبوو، مانگانەو ساڵانە زیارەتیان دەکردن و قوربانییان بۆ سەردەبڕین، بەمەش لەگەڵ هۆزو خێڵەکانی تردا تێکەڵاو دەبوون و لەیەك نزیك دەبوونەوە.

2. مانایەکی بازرگانیی: ئەو هۆزو خێڵانەی خاوەنی بتە ناودارەکان بوون پشکی زێوانی و نانبدەیی و وەرگرتنی دیاریی و خەڵاتیان پێدەبڕاو دەوڵەمەند دەبوون و لەسەری دەژیان. بۆ مەبەستی بازرگانییش خەڵکی دوورگەی عەرەب (قوڕەیش)یان بە شایستەتر دەزانی، لە هەر هۆزێکی تر.

3. مانایەکی سیاسیی: قوڕەیش کەخاوەنی بتە ناودارەکان بوون، زێوانی و سەرپەرشتی کابەی بەدەستەوەبوو. لەڕووی سیاسییشەوە دەستی توند کردبوو لە دەسەڵاتی (سیاسیی، ئایینیی، کۆمەڵایەتیی، بازرگانیی)و هەموو هۆزو تیرەکانی دەورووبەر بە پرس و ڕای قوڕەیش دەجوڵانەوە، چونکە پێیان وابوو قوڕەیش لەلایەن بتەکانەوە دەسەڵاتی ئایینیی و سیاسییان پێدراوەو نابێ هیچ کەسێك کێبڕکێیان لەگەڵدا بکات. کاتێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەرکەوت، لە لاوازکردنی ئەم جومگە سەرەکیانەوە دەستی پێکرد کە خاڵی هەرە بەهێزی (قوڕەیش)ی هێمای (بتپەرستی)و هەموو بتپەرستانی دوورگەی عەرەبی بوو. بە سادەیی و بێگرێ، بتپەرستی بۆ (قوڕەیش)و (بتپەرستان) لەلایەکەوە (ئایین) بوو، لەلایەکی دیکەشەوە (بازرگانی و پارە)، لێرەوە دەتوانین تێبگەین کە بتپەرستان بۆچی و لەبەرچی دژایەتی پێغەمبەریان دەکرد، هەرچی مانای تاقانە پەرستییشە سەرکوتان و هەڵتەکاندنی ئەو چەمکانەو، داڕشتنەوەی عەقڵی مرۆڤە لەسەر بناغەی تاقانەپەرستیی و پەیوەندی (خوای تاقانە) بە عەبدەکانی خۆیەوە، ناردنی وەحی بۆ پێغەمبەران (عليهم السلام)و ناساندنی پرۆگرامەکانی ئاسمان بە مرۆڤایەتیی و جارێکیتر ناساندنەوەی خواو چەمکەکانی خواپەرستی بە عەقڵ و ویژدانی مرۆڤ...

**سەبارەت بە دیدی ڕیفۆرمخوازیی پێغەمبەر (ﷺ):**

(پێویست) لە بەشی یەکەمی کتێبەکەیدا جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە موحەممەد (ﷺ) پێش بانگەشەی پێغەمبەرێتی ڕیفۆرمخواز بووە، عەقڵێکی گەورەی هەبووەو خاوەنی هۆشیارییەکی زۆر بووە، ئەم باسانەی نووسەر بۆ کوشتنی هەناسەی ئیماندارانەی خوێنەرە بە جامی (هەنگوین)، ئەم گوتانە تازە نین، نووسەرە چەپ‌و بێباوەڕەکانی عەرەب، نەریتیان وابوو بە پێغەمبەریان دەوت (موحەممەدی بلیمەت)، (موحەممەد شۆڕشگێڕ)و (موحەممەدی نەتەوەپەرست)، هاتنی ئەم موفرەدانە لە ئەدەبیاتی ئەو نووسەرانەدا بۆ دوو مەبەستە:

یەکەم: بۆ ئەوەی خوێنەرانی عەرەب پێیان نەڵێن ئەمانە بێباوەڕن.

دووەم: بۆ ئەوەی چەمکی (وەحی) لە پەیامەکەی موحەممەد (ﷺ) دابڕێن‌و مەسەلەکە لە بلیمەتی مرۆڤێکدا کۆبکەنەوە، تەلیسمی ئاسمانیی بوون لە پەیامەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بکەنەوە.

هەمان مەبەست‌و ئامانج لەم نووسراوەشدا دیارەو نووسەر فێڵێکی دووبارە لە خوێنەری کورد دەکات. باسکردنی باری ڕیفۆرمخوازیی لەکەسی پێغەمبەردا (ﷺ) بەدەر لەبەهرەی پێغەمبەرێتی، هەوڵێکیترە بۆ کاڵکردنەوەی ڕەنگ‌و ڕووی (نبوة) لە پاڵ عەقڵیەتی ڕیفۆرمخوازییدا، بوونی بەهرەی (نبوة)یش خۆی لەخۆیدا مانای نەبوونی ڕیفۆرمخوازی لای موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا (ﷺ) ناگەیەنێت. لە سەرچاوەکانی سیرەدا ئەم مەسەلەیە ئاماژەیەکی پێدراوە، پێغەمبەر (ﷺ) لە پێش پەیامی پێغەمبەرێتیدا، کەسێکی ناودارو کۆمەڵایەتیی بووە، بەچاوی ڕێزو پێزانینی تایبەتەوە سەیری کراوە، لە هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتییدا لە خەڵکی تر جیابووە، لە دنیای گاڵتەجاڕی‌و هەرزەگۆیی‌و سەرەڕۆیی‌و لادانی ڕەوشتیی‌و مەیخۆریی‌و گاڵتەوگەپی یانەو دانیشتنەکانی تری خێڵی قوڕەیشەوە دووربووە. ڕامانی زۆر بووە، هەمیشە لە ناخی خۆیدا بیری لە دروستکەری ئاسمانەکان‌و زەمین‌و دنیای خەڵك کردووەتەوەو سەرنجی داوە لەو نادادیی‌و بێسەروبەرییەی لە کۆمەڵگاکەیدا بووە. پرسیاری لەخۆی کردووە، کە هەموو ئەم ستەم‌و بێدادیە لە پاڵ هەبوونی خوایەکی دروستکەردا بۆ دەبێ ڕووبدات؟، لەوانەشە ئاواتی خواستبێ کەسێکی چاکەخواز دەرکەوێ‌و بانگەشەی چاکەو خێربکات‌و ئەمیش وەدووی بکەوێت. تا ئەو ساتەوەختەش کە نیگای لە ئەشکەوتی (حراء)دا بۆ هاتەخوارەوە بیری لە سەرۆکایەتیکردنی دنیای دەوروبەری خۆی نەکردبووەوە، بۆ چاککردنی ئەو ڕەوشە، چونکە لادان‌و ستەم‌و نادادیی هەموو گۆشەو قوژبن‌و لاپاڵێکی دەروماڵی کۆمەڵگای گرتبوو. لەڕووی عەقایدیەوە (360) بت لەناوو دەرەوەی کەعبەدا بوو، سیستمی کۆیلایەتی، مرۆڤایەتی سیخناخ کردبوو، سیستمی (سووکاریی) لە قەرزو مامەڵەی دراودا وەك نان وەهابوو، ژیانی چینایەتیی گەردانەی باڵای دوورگەی عەرەب بوو. هەڵکوتانە سەر یەکترو شەڕی عەشیرەتگەریی‌و ڕفاندنی کەنیزەك‌و لەخوادووریی‌و بەدڕەوشتی‌و وابەستەی دوای خەڵك، ئەمانە هەمووی لە عەقڵ‌و دیدی مەحەممەدەوە (ﷺ) دیاربوو، هەستی دەکرد ئەمانە بەڵای گەورەن‌و دەبێ چارەسەربکرێن، بەڵام چۆن‌و لەکوێوە دەست پێبکات؟، هەنگاوی یەکەم چی بێت؟، دەستبداتە چ گۆشەیەکی ئەو گوناهانە، تابتوانێ وردە وردە برینەکان سارێژ بکات؟، ئایا لە بیروباوەوە دەستپێبکات، یان ژیانی کۆمەڵایەتیی‌و ئابووریی؟، لەخەڵکی ڕەش‌و ڕووتەوە، یان لەسەر زل‌و ملهوڕەکانی قوڕەیشەوە دەست پێبکات، بەرنامەسازیی ئەم گۆڕانە گەورەیە چۆن دەبێت؟، کێن ئەو کەسانەی دەبنە هەڵگری ئەو بزووتنەوە ئیسلاحییە؟، کەرەستەکانی چی دەبن؟، ئایا ئاسۆکانی سەرکەوتن‌و گۆڕان چەند دیارن؟.

زەحمەتەو بگرە مەحاڵە لە کەش‌و هەوایەکی وەك ئەو کاتەدا مرۆڤ بتوانێ بە تەنها بیربکاتەوە. دەستپێبکات‌و ئەو گۆڕانە مەزنەش لە ماوەی (23) ساڵدا دروست بکات. لە عەقڵەوە بۆ ژیان‌و پەیوەندیی‌و سیاسەت‌و کۆمەڵگاو تاکەکان‌و یاساو ئابووریی، چەمکی دەسەڵات هەمووی بگۆڕێت‌و میللەتی نوێ لەسەر بنەمای بڕوا پتەوی تاقانەپەرستیی دابمەزرێنێت‌و لە ماوەی (23) ساڵدا بەرهەمی کولتووریی سیاسیی‌و ئایینیی‌و کۆمەڵایەتیی بتپەرستی زیاتر لە هەزار ساڵ تەفروتونا بکات، بەوتنی وشەی (لا اله الا الله).

بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکانی سیرەو مێژوو، بەتەواوی ئەو دابڕانە گەورەیە هەست پێدەکەین، لەکاتێکدا موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا (ﷺ) لە خەمەکانی دەوروبەری کۆمەڵگا خۆی کەنار دەگرێت‌و لە گۆشەیەکی تاریکی ئەشکەوتی

(حراء)دا دڵی خۆی بە ئەندێشەو بیرکردنەوە، ڕووناك دەکاتەوە لەکاتو ساتەوەختی نادیاردا فریشتەی نیگا، (جبریل)ی پایەبەرز، دێتەی لای و پێی دەفەرمویێت موحەممەد (إقرأ)، ئەویش لەسەرسامی پرسیارەکەدا دەفەرموویێت (ما أنا بقاريء) من خوێندەوار نیم، پاشان چەند جارێك بەخۆیەوە دەگوشێت تا هەناسەی سوار دەبێت، ئەوجا بەری دەداتو دەفەرموویێت (إقرأ باسم ربك الذي خلق* خلق الانسان من علق* إقرأ وربك الأكرم* الذي علم بالقلم* علم الانسان مالا يعلم) واتە: بخوێنە بەناوی پەروەردگارتەوە، ئەو پەروەردگارەت کە هەموو جیهانی بەدیهێناوە، مرۆڤی لە خوێنپارە بەدیهێناوە، بە ناوی پەروەردگاری شکۆداری خۆتەوە بخوێنە. ئەو پەروەردگارەت کە مرۆڤی بە پێنووس فێرکرد، مرۆڤی لە هەموو ئەو شتانە بەئاگا کرد کە نەیدەزانین.

ئەمە خاڵی دەستپێکی نیگایە، لە پەروەردگاریێتی خوداوە دەست پێدەکات. پاش زانستی هەناوزانی، پاشان خوێندنو فێربوون، پاشان پێنووس، پاشان گەڕان بەدوای زانستدا، ئەمانەن سەرەتاکانی گۆڕان. دەستپێکردنی لەم خاڵەوە، بۆ خودی پێغەمبەریش (ﷺ)، جێگەی سەرسوڕمانو پرسیار بووە. لەسەرەتادا لەو ڕاستیەش تێنەگەیشتبوو کە ئەمە (نیگا)یەو لە ئاسمانەوە دابەزیوە، تا پرسیاری لە (وەرەقەی کوڕی نەوفل) کرد، دوای ئەویش بەگومان بوو، هەتا دوا بەدوای ئەوە ئایەتیتر هاتە خوارەوەو جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە تۆ ئەی موحەممەد، پێغەمبەری خوایتو ئەوەی بۆت دێت (وەحی)یەو لە ئاسمانەوە خوای مەزن بە (جبریل)دا دەینێرێت. بۆ ئەم مەبەستە ئەگەر لاگوزەرێك بکەین بەناو فەرموودەکانو نووسراوی سیرەنووسەکاندا، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت کە من لێرەدا چەند ئاماژەیەکی بۆ دەکەم:

1. بوخاری دەگێڕێتەوە، عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموویێت: "یەکەمجار کە نیگا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هات، بە خەونی چاکان دەستی پێکرد"، هەندێ جاریش بەو خەونانە دەوترێ خەونی ڕاستگۆ، مەبەستیش لێرەدا ئەو خەونەیە کە دڵی پێگوشاد دەبێتو گیانی پێ بەرز دەبێتەوە[1]

2. پێش دابەزینی وەحی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە ئەشکەوتی حەرائدا، خەونی خۆشو باشی دەبینی، بەدڵگوشادیی هەڵدەستا. پاشان هەستی بەرەو گۆشەگیری دەجوڵاو حەزی دەکرد لە سەرقاڵیو ئاڵۆزییەکانی ژیان گۆشەگیریی بکا، بەدڵو دەروون، ڕازو نیازی لەگەڵ بەدیهێنەری گەردوونو ئاسمانەکانو زەمین دەکرد، هەتا ڕۆژی دووشەممە لە حەڤدەیەمی ڕەمەزاندا، بە ڕێکەوتی (600/8/6ز)دا کوتوپڕ پیاوێکی لێ پەیدا بوو پێی وت "موحەممەد، مژدەبێ تۆ بووی بەپێغەمبەری خودا بۆ سەر ئادەمیزادو منیش جبرەئیلم"[2].

ئەوەبوو پاش خوێندنەوەی ئایەتەکانی (إقرأء) بەسەریدا، دڵی کەوتە تەپەتەپو گەڕایەوە ماڵەوە بۆلای خاتو خەدیجەی هاوسەریو فەرمووی (زملوني.. زملوني) واتە: دامپۆشن، دامپۆشن. ئەوجا ڕووی کردە خێزانەکەیو فەرمووی "خەدیجە من چیم لێبەسەرهاتووە؟"، ئەم پرسیارەی پێغەمبەر (ﷺ) کە لە هەموو سیرەدا بۆمان گوازراوەتەوە دەری دەخات کە تا ئەوکاتە پێغەمبەر(ﷺ)، ئاگای لە بەهرەی پێغەمبەرێتیی نییەو ناشزانێ چی لێبەسەرهاتووە. نەك هەرئەوە، بگرە (خەدیجە)ی خێزانی دەکەوێتە دڵنەواییکردنیو ئاگاداری دەکات، کە ئەو هەمیشە پشتو پەنای بێباوكو هەژاران و لێقەوماوانە، مەحاڵە خوای مەزن کاری خراپی بەسەر بهێنێت، بەمەش دڵی ئاو ناخواتەوە، هەتا سەردانی (وەرەقەی کوڕی نەوفل)ی ئامۆزای خەدیجە دەکەن، کە شارەزای (ئینجل) بووەو ڕاستیی مەسەلەکەی بۆ ڕوونکردۆتەوە.

3. لە (صحيح البخاري)دا هاتووە کە پاش هاتنی نیگا بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، فەرمووی "لەهەموو دروستکراوەکانی خوادا شت نەبووە لەلام لە شاعیر، یان شێت، زیاتر ڕقم لێیان بووبێتەوە، چاوم بەرایی نەدەهات سەیریان بکەم، دەفەرمویێت، وتم: مەحاڵە قوڕەیش من بە شاعیر، یان شێت، ناوزەد بکەن. دەڕۆمە سەر ئەو کێوە بەرزەو خۆمی لێوە فڕێ دەدەمە خوارەوەو خۆم دەکوژمو دەحەوێمەوە، بە مەبەستەوە چوومە دامێنی چیاکە، گوێم لێبوو دەنگێك لە ئاسمانەوە دەڵێت: ئەی موحەممەد تۆ پێغەمبەری خودایت، من جبرەئیلم.."[3].

---

[1] عبدالعزیز پارەزانی، ژیانی پێغەمبەری مەزن (ﷺ)، پڕۆژەی (100) کتێبی کوردی، لێکۆڵینەوەی ڕزگار کەریم، چاپی (2003) نەشری ئیحسان، ل107، هەروەها (تأريخ الطبري) 532/1، هەروەها (البداية والنهاية 11/3).

[2] صفي الدين المباركفوري، الرحيق المختوم، (گولاوی سەرمۆر)، وەرگێڕانی (بەکر حەمەصدیق) بلاوکراوەی (نشري احسان)، 2003، تاران ل76.

[3] مناع القطان، مباحث في علوم القرآن، مكتبة وهبة، الطبعة الحادية عشرة، 2000م، ص26–27.

له كتێبەكانی سیرەو فەرمووده‌كانی پێغەمبەردا (ﷺ) دەیان ڕیوایەتی (صحیح)ی بەم شێوەیە هەن. ئێمە لێرەدا ئەوەندەمان بەسە بۆ نموونە، مەبەستەكەش ڕوونە، بۆ ئەوەی خوێنەر بەجددیی تێبگات كە هاتنی وەحی بۆ خودی پێغەمبەر (ﷺ) ڕووداوێكی لەناكاو بووەو ئایاتەكان بەپێی ویستی خودایی، لە قۆناغ و زەمەنی جیاوازدا دابەزیونەتە سەر دڵی پێغەمبەر (ﷺ)، هەموو جۆرە قسەیەكی دژ بەم ڕووداوە ڕاستانە، پێچەوانەی ڕووداوەكانی مێژوون و بەڵگەن لەسەر بێئاگایی (پێویست) بە سیرەو مێژوو.

دوای ئەو ڕووداوانەش، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێئاگابووە لە سەرجەم ئەو ئایەتانەی دابەزیوون، لەڕووی داڕشتن و ناوەرۆك و كات و شوێنی هاتنی وەحیەوە، پێغەمبەر (ﷺ) هیچ زانیارییەكی نەبووە. زۆرجاریش كە پرسیاری لەبارەی بابەتێكی هەستیارو ئاڵۆزەوە لێدەكرا، نەیدەتوانی وەڵام بداتەوە، دەوەستا هەتا وەحی بۆ دەهات، ئەوجا ئایەتەكانی بەسەر پرسیاركەرەكاندا دەخوێندەوە. ئەگەر كاكی نووسەر بەحوكمی ئەوەی عەرەبییەكەی باش نییە، نەتوانێ دەقێكی قورئان لەگەڵ فەرمووده‌یەكی پێغەمبەر (ﷺ) یان فەرمودەیەكی (قودسی) لەیەك جیابكاتەوە، ئەوا لەكاتی خۆیدا موشریكەكانی زمانزانی عەرەب ئەو ئەركەیان لە كۆڵی كاكی نووسەر كردووەتەوە. بێگومانبوون لەوەی كە قورئان قسەی موحەممەد نییە، لەوەش دڵنیابوون كە هیچ مرۆڤێك ناتوانێ بەو ڕیتمە بەرزە، تێكستێكی باڵای وەك قورئان بنووسێت. بەباشی ژیاننامەی موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلایان دەزانی، لەوە حاڵی بووبوون كە ئەم زانیارییەی لەهیچ كەسێك وەرنەگرتووە، بۆیە تۆمەتی ئەوەیان دەدایە پاڵی كە (جنۆكە)و پەریان فێری دەكەن. ئەم تۆمەتەش بۆ ڕاكردن بوو لە ڕاستیی دابەزینی وەحی و خۆ گێلكردن بوو لەوەڵامی ئەو پرسیارانەی كە وەڵامەكانیان لە زەمیندا دەست نەدەكەوت، بەڵام كاكی نووسەر، بازدەدات بەسەر ئەو پرسیارە گرنگانەی مێژووداو دەكەوێتە نێو بەیتی ئەوەی گوایە لە كەسانێكی دیكەی وەرگرتووە. پاش هەزارو چوارسەد ساڵ خوێندەواری و گۆڕان، تازە بەتازە (پێویست) دەڕواتەوە بۆ سەردەمی خوارتر لە عەرەبە جاهیلەكانی دووركەی عەرەب!!، كاكی نووسەرو هەموو ئەو كەسانەی دیكەش كە بێباوەڕن بە پەیوەندی ئاسمان بە زەمینەوە، دەبێ لەبەردەم دیاردەی (وەحی)دا بوەستن، وەڵامی ئەم پرسیارە گرنگانە بدەنەوە، یان وەربگرن. دەقی قورئان لە ڕووی داڕشتن و پێكهات و ماناوە تا ئەم ساتەوەختە باڵاترە لە هەموو ئەو تێكست و پارچە ئەدەبی و فیكریانەی مرۆڤ لە مێژوودا مامەڵەی لەگەڵدا كردوون، لە ماوەدای زەمەنیی (1400) ساڵ لەمەوبەر، چۆن موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلا لە ناوبڕێكی زەمەنیی كورتدا، كە كەمترە لە مانگێك (كەمانگی دابەزینی وەحیە)، ئەم دەقە پایەبەرزە پڕ لە سەراسیمەو سەرسووڕهێنەرە بنووسێت؟!، چۆن نووسی، ئەی بۆچی (40) ساڵ بێدەنگ بوو، هیچی نەوت؟ لە پڕێكدا كەوتە كەلامەو چۆن كەلامێكیش، (وەحی)!!.

بۆ منی ئیماندار وەڵامی ئەم پرسیارە كون و قوژبنگەڕانی نا و كەلێن و گۆشە پڕ لە تەلیسمەكانی فەلسەفەی ناوێ. من باوەڕم هەیە كە ئەوە وەحیەو هەموو موفرەدەو شوێن و كات و ڕووداوەكانی ئەو سەردەمە پێم دەڵێن، بەیەقین موحەممەد (ﷺ) وەحی بۆ هاتووە، بەڵام كاكی نووسەر سەرباری ئەوەی گوتەیەكی نامەنتیقی و بێبەڵگە بەخەڵك دەڵێت، ئیدی چۆن خۆی لەم سەرگەردانیە ڕزگاركردووە، یان داخۆ تەنها ذكوڵیكردن لەڕاستەقینەیەكی گەورەی وەك وەحی، ئارامی دەبەخشێ بە عەقڵ و ناخ و ویژدانی ئەو؟!، بێگومان نەخێر، هاوكات خوێندنەوەی قورئان و سەردەمی دابەزین و شوێنی دابەزینەكەی ئەم گرێیە دەكاتەوە بۆ نووسەرو خەڵكانی دیكەش، چونكە قورئان دەنگێكی گەورەترو فراوانترو قوڵترە لە زەمەن و كاتەكەی خۆی، ئەم عەقڵە كامەیە كە مەوداكانی شوێنكات تێدەپەڕێنێ و بە ئەندازەی دەریا بێسنوورەكەی قورئان، گەورەتر لە هەموو شتێ، بیردەكاتەوە. موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلا (ﷺ) بۆ خۆی سەرسامە لەبەردەم ئەو زانستە گەورەدا كە بۆی دێت، هاوكات قورئانی پیرۆزیش ساتەوسات بیری دەخاتەوە، كە تۆ (ئەی موحەممەد)، لەم داستانە بێئاگا بوویت "وإن كنت من قبل لمن الغافلين".

پرسیاری دووەم ئەوەیە، كە كێ و كەی و چۆن فێری كردووە؟ نە (پێویست) و نە هیچ كەسێكی دیكەی تریش، ناتوانێت ئەو پرۆسەیە بە ئەندازەی ئەوەندە ساغ بكاتەوە، كە هیچ نەبێ (مەنتیق)ێك بدا بەگومانەكەی ئەوان، (كێ، كەی، چۆن) لە

دەقی نووسراوەکەی (پێویست)دا بەهیچ شێوازێك وەڵامی نییە، ئەمە مەیدانی تەحەداو سەلماندنی ڕاستییەکانە، با ئەو زرنگ بێ و ناوی (کێ) کانمان پێ بڵێ!، یان وەڵامی (کەی)ەکانمان بداتەوە، یان (چۆن)ەکانی چی لێدەکات؟!.

قسە فرێدان بۆ کۆشی خوێنەرو لانەکردنەوە بۆ وەڵامەکانی بەرامبەر، بەشێکە لە مەنهەجی نووسینی (پێویست)، ئەمەش لە بواری نووسینی مێژوویی و ئەکادیمیدا هیچ بایەخێکی نییە، بۆیە ئەم پرۆسەی بەدگومانکردنەی (پێویست) بۆ خوێنەران، پڕۆسەیەکی نەزۆکەو هەر لەسەرەتاوە لە زەینی خودی نووسەردا لەبارچووە، چ جای ئەوەی کۆمەڵە پرسیارێکی فەلسەفیی زیندووبن و مرۆڤ بخەنە ناو ئەندێشەی بیرو بڕوای نوێوە!.

لە پرسیاری سێیەمدا، ئەوە وەبیری (پێویست) دەهێنمەوە، کە کەسێتیی موحەممەد (ﷺ) وەك مرۆڤێکی ناوازەی مێژوو لە ڕەوشتبەرزی و قورسایی کەسێتی و ناوبانگی باشەیدا، پێویستی بە بانگەشەیەك نەبووە کە لەناو دوورگەی عەرەبیدا گەورەی بکات و ناوی پێبدات، چونکە خۆی ئەو سەرمایە ماناییەی هەبووە، لە پاڵ بوونی (وەحی)و بانگەشەی پێغەمبەرێتیدا، نەك هەر لە سایەیدا نەحەوایەوە، بگرە گەورەترین ئەرك و سەرئێشەو شەونخونی و نەهامەتی هێنا بەسەر موحەممەددا، هەرچی کەرەستەی چاوچنۆکیی و دونیاویستی و ڕابواردن و خۆشگوزەرانی دنیای ئەو سەردەمەش هەبوو، خرایە بەردەستی، بۆ یەك ساتەوەخت وازی نەهێناو درێژەیدا بە زەحمەت و دەردەسەریی سەلماندنی ماناکانی وەحی لەناو خەڵکیدا. بۆ موحەممەد (ﷺ) ئەوە ئاسانتر بوو کە نەیگوتایە من پێغەمبەرم، کە نەیوتایە وەحیم لە ئاسمانەوە بۆ دێت، چونکە بەتەنها یەك ئاماژە، هەموو ئاواتەکانیان بۆ دەخستە ژێر پێی. هەڵبژاردنی ڕێبازی وەحی بڕیاری خوداوەندی باڵا بوو، بەدەست موحەممەدیش (ﷺ) نەبوو، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا (ﷺ) یەکەمین پێغەمبەر نەبوو کە وەحی بۆ بێت، دیاردەی وەحی هاتن بۆ پێغەمبەری خودا، دیاردەیەکە لە مێژوودا چەندین جار دووبارەبووەتەوە، پرسیاری سەرەکی خەڵکی لەبارەی توانای ڕوودانی وەحیەوە نەبووە، چونکە زانیویانە کە پێغەمبەرێك پەیدا دەبێ و وەحی بۆ دێت، بەڵکو پرسیارەکە ئەوەبووە، کە ئەوکەسە پەسندیدە خواییە کێیە شایستەی وەحی بۆ هاتن بێت؟، جولەکە بە میراتی خۆیانی دەزانی، چونکە زۆرینەی پێغەمبەران (علیهم السلام) لەناو کوڕانی ئیسرائیلدا هەڵکەوتوون، بۆ ناو ئەوانیش هاتوون، هەتا عیسا (علیه السلام).

کاتێ کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای لەناو موشریکانی هیچ نەزاندا هەڵدەکەوێت، جولەکە سەدان بیانوو بوختان و درۆی ناهەق بەدەوریدا هەڵدەبەستن و هەموو ژیانی خۆیان تەرخان دەکەن بۆ شێواندن و ناشیرینکردنی لەپێش چاوی دنیا، هیچ دەرفەتێکیان لە کیس نەدا بۆ لێدانی ئایینەکەی موحەممەد (ﷺ)، بۆیە هەموو دنیا، یان باوەڕی هێنا بەم ئایینە، یان لەدوورەوە وەستاو بەڕێزەوە سەیری کرد، جگە لە جولەکەو هاوڕێبازەکانی، هەر ئەم ڕێبازەیە کە ئەمێستاکێ درێژەی هەیەو ڕۆژانە دەیان چاپکراوی نوێ لەسەر پڕۆسەی ناشیریکردن و بەدگومانکردنی خەڵك دژ بە ئیسلام دەخەنە بازاڕەوە.

زیاد لەم تێڕوانینە، بۆ دەرخستنی دیاردەی (وەحی)، چەند باری سەرنجێك دەخەمەڕوو:

لەکاتێکدا بەخوێندنەوەی ڕووداوەکانی مێژوو ئەو ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کەدیاردەی ناردنی وەحی لەلایەن خوداوەندەوە بۆ مرۆڤە مەزن و دڵ و دەروون پاك و بیرمەندەکانی مێژوو، نامۆ نییە، ئەو کەسانە لە مێژوودا بە پێغەمبەرانی خودا ناسراون. پێغەمبەران (علیهم السلام) لەگەڵ ڕیفۆرمخوازەکان و فەیلەسوفەکان و ڕووناکبیرەکانی مێژوودا جیاوازیان زۆرە، لەمێژوودا مرۆڤەکان ئەو کەسانەیان ناسیوەو لەیەکتریان جیاکردووەتەوە، پێغەمبەرانیش لە دنیایەکی جیاوازدا نەژیاون، بەڵکو لەناو میللەت و خەڵکیدا ژیاون و هەڵسوکەوتیان لەناو کۆمەڵگادا بووەو لەنزیکەوە خەڵکی بەباشیی ناسیویانن، زۆر مرۆڤبوونیان بە ئەندازەیەك بووە خەڵکی پرسیاری ئەوەیان کردووە، کە چۆن دەبێ نێردراوەکانی خودا لەناو مرۆڤدا بن؟!، بەڵام ئەوە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە، پڕۆسەی پەیدابوونی فەیلەسوفێك، یان ڕووناکبیرێك، یان ڕیفۆرمخوازێك، پەیوەستە بە هەوڵ و کۆشش و خوێندنەوەو بەدواداچوون و ئاستی قوڵی بیرکردنەوەو خوێندەواریی مرۆڤەکانەوە. لە هیچ گۆشەیەکی دنیادا ڕووی نەداوە فەیلەسوفێك لەپڕێکدا پەیدا بێت، یان ڕیفۆرمخوازێك وەك قارچکە بەهارە لەپڕێکدا هەڵتۆقێت و خۆی پیشانی کۆمەڵگاکەی بدات! یان ڕوناکبیرێك لەناکاوێکدا بڵێ من پێشڕەوی

ڕۆشنبیریی و کەلتووریی ئێوەم، وەرن دوای من بکەون. ئەم جۆرە مرۆڤانە لەناوخەڵکیدا وەك لێهاتن و خوێندنەوەو بەدواداچوون خەڵکی تێبینی کردوون و هیچ یەکێ لەوانەش بانگەشەی (پێغەمبەرێتی) نەکردووە، بەڵام پێغەمبەران (علیهم السلام) کە لەناو کۆمەڵگاکەی خۆیاندا ڕابردوو ئێستاکەو هەڵسوکەوت و سلوك و ڕەفتاریان زانرابوو، نە فەیلەسوف بوون و نە ڕیفۆرمخوازو نە ڕووناکبیر، بەڵام خۆ لە هەموو ئەوانەش گەورەتر بوون، بەهۆی یەك هۆکارەوە. تەنها لەبەرئەوەی کە (وەحی)یان بۆ هاتووە. وەحی دیاردەیەکی ڕۆحانیی ئیلاهییە، ناوەڕۆکی پەیامی ئاسمانە، خودای مەزن لەڕێگەی (جبریل)ی فریشتە، یان ڕاستەوخۆ، بۆ پێغەمبەرانی خۆی دەنێرێت و باس لەڕێبازی خوداشوناسی خودناسیی و مرۆڤناسی و کۆمەڵناسیی و ڕێکخستنی شێوازی ژیان و پەرستن، بۆ مرۆڤەکان دەکات. بەم مانایە پێغەمبەران (علیهم السلام)، پێش ئەوەی وەحیان بۆ بێت، لە چاوەڕوانیدا نەبوون، یان بە پەروەردەی نەفس و دەروونزانی نەگەیشتوونەتە پلەی وەحی بۆ هاتن، ئەمە فەزیلەتێکە خوداوەندی گەورە دەیبەخشێت بە هەندێ لە بەندەکانی خۆی، لەم ماناو لێدوانە وەحی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دابەزیوە، هەر ئەم ناوەڕۆکەشی لە خۆگرتووە. لە زەمەنێکدا وەحی دێت بۆ موحەممەد (ﷺ) کە تا هاتنی ئەو نیگایە، خاوەنی یەك تێکستی تایبەت بەخۆی نەبووە، نە دیدگا، نە بەرنامە، نە بانگەواز، نە ڕێبازلا گۆڕینی کۆمەڵگا لە زەینی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵادا نەبووە. ئەگەر ببوایە ئەمێستاکێ لە بەردەستدا دەبوو، هیچ نەبێ موشریکان دەیان کرد بە هەراو لێی دەهاتنە دەنگ، هەتا ئەو کاتەی وەحی دێ بۆ موحەممەد (ﷺ)، موشریکان پێیانوایە کە موحەممەد ئەمینداترین و مەزنترین مرۆڤی شاری مەککەیە، کەچی کە وەحی بۆ دێت، دەیکەنە (شێت و شاعیرو جادوگەرو گومڕا)، چەندین ناوو ناتۆرەی ناڕەوا، کە شایستەی کەسە خراپەکانی مێژووش نییە، چ جای پێغەمبەری گەورەی ئیسلام!!.

## پێناسەی نیگا (وەحی)

لەڕووی زمانەوە: لە زمانی عەرەبیدا (وەحی) بەمانای ئاماژەی خێرا دێت، یان دواندنی نهێنی، ئەم ئاماژەیە، یان دواندنە خێراو نهێنیە، بەهێما دەبێ، یان خستنەڕوو، یان دەنگێك، یان ئاماژە بە هەندێ لە هەستیارەکان. وشەی وەحی چاوگەو ئاماژەیە بۆ دوو مانای سەرەکیی، یەکەم– پەنهانیی، دووەم– خێرایی. بۆیە وتراوە: نیگا (وەحی) ئاگادارکردنەوەیەکی پەنهانیی خێرایی تایبەتە بۆ ئەوکەسەی ئاڕاستەی دەکرێت، بەشێوازێك کەسی تر پێی نازانێت، لەزاراوەشدا ماناکەی بریتییە لە (ئاگادارکردنەوەی خواوەند بۆ فرۆستایەکی هەڵبژاردەی بەندەی خۆی بەوەی دەیەوێت، بە شێوازێکی نهێنی خێرا)[1].

لە سۆنگەی قورئانەوە، چۆن نیگا دادەبەزێت؟

لەچەند شوێنێکدا قورئانی پیرۆز ئاماژەی داوە، بە دابەزینی وەحی لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەمین و بۆ سەر دڵی پێغەمبەر (ﷺ)، چەند نموونەیەك دەهێنینەوە:

1. (إنا أنزلناه في ليلة القدر) سورەتی القدر ئایەتی (1) واتە: ئێمە ئەم قورئانەمان لەشەوی قەدردا دابەزاندە سەر زەوی.

2. (إنا أنزلناه في ليلة مباركة) سورەتی (الدخان) ئایەتی (3)، واتە: ئێمە ئەم قورئانەمان لە شەوێکی پیرۆزدا دابەزاند.

3. (شهر رمضان الذي أنزل فيه القرآن) سورەتی (البقرة) ئایەتی (185)، واتە: مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کە قورئانی تێدا دابەزی...

4. (وإنك لتلقى القرآن من لدن حكيم عليم) سورەتی (الفرقان) ئایەتی (33)، واتە: تۆ ئەی موحەممەد، لە خوایەکی داناو زاناوە ئەم قورئانە وەردەگریت.

---

[1] شێخ عبدالعزیز پارەزانی، ژیانی پێغەمبەری مەزن (ﷺ) پرۆژەی (100) کتێبی کوردی (43)، لێکۆڵینەوەی (ڕزگار کەریم) چاپی 2004، ل108.

5. (وإن أحد من المشركين استجارك، فأجره حتى يسمع كلام الله) سورەتی (التوبة) ئایەتی (6) واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر کەسێك لە موشریکەکان پەنای بۆ هێنایت، پەنای بدە، هەتا کەلامی خواوەند دەبیستێ...

6. (...إن اتبع الا ما يوحى الي..) سورەتی (یونس) ئایەتی (15)، واتە: من پێغەمبەری خودام (ﷺ)، دەبێ تەنها شوێنی ئەوە بکەوم کە بە وەحی بۆم دێت..

7. (ان هو الا وحي يوحى) سورەتی (النجم) ئایەتی (4) واتە: ئەو جگە لەوەی وەحی بۆ دێ شتێکی دیکە نییە.

8. (قل نزله روح القدس من ربك بالحق) سورەتی (النخل) ئایەتی (102)، واتە: ئەی موحەممەد بڵێ: ئەو قورئانە (روح القدس)، واتە (جبريل) لەلایەن پەروەردگارتەوە، بە ڕاستی ناردوویەتی.

یان ئاماژەی قورئانیتر هەیە کە بەڵگەی ڕاستەقینەی دابەزینی نیگایە لەلایەن خوداوە بۆ پێغەمبەری مەزن (ﷺ)، لەبەر درێژە نەدان بە باسەکە ئەوەندە بەسە.

هەموو زانایانی ئوممەت پێش و پاشیش (السلف والخلف) لە سەردەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ) هەتا ئەم ساتەوەختە یەکدەنگن لە هەموو دنیادا کە (قورئان) کەلامی خودایەو بە نیگا بۆ سەر دڵی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ) دابەزیوە. چەند سیفەتێکی نەگۆڕی هەیە، لەوانە قورئان کتێبی سەراسیمە (معجز)یەو سەلمێنراوە کە لە لایەن خوداوە هاتووە، خوێندنی عیبادەتەو دەبێ بە (لفظ)و شێوازی خۆی بخوێندرێتەوە، چونکە بە (لفظ و معنی)وە لەلایەن خوداوەندی گەورەوە هاتووە.

**چۆن (وەحی) بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەهات؟**

باری یەکەم: وەك دەنگی زەنگێك دەهاتە گوێی، کەبەم شێوازە نیگای بۆ دەهات. بە تەواوی خۆی گورج دەکردەوە بۆ وەرگرتنی پەیامەکە، وەکو خۆی ئەمەش لە دیوانەکانی بوخاریدا چەسپاوە.

باری دووەم: فریشتەی جبریل (ﷺ) لە شێوازی پیاوێکدا دەهاتە خزمەتی، بەشێوەی ئاسایی وەك دوو پیاو قسەیان پێکەوە دەکرد. زانایان دەڵێین: دەرکەوتنی جبریل (ﷺ) بە شێوازی پیاوێکی ئاسایی مانای ئەوە ناگەیەنێت کە جبریل بووە بە مرۆڤ، بەڵکو بۆ زیاتر هۆگریی و حەوانەوەی دڵی پێغەمبەر بووە (ﷺ).

هەردوو بارەکە لە کورتەی ئەم فەرمودەیەدا هاتووە: لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێت) حارس کوڕی هشام (ڕەزای خوای لێبێت) پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خودا (ﷺ): "ئەی پێغەمبەری خوا.. چۆن نیگات بۆ دێت؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: هەندێ جار وەك دەنگی زەنگێك دێتە بەرگوێم، لەوبارەشدا زۆر لەسەر جەستەم سەختو دژوار دەبێ، هێزم لەبەڕدەبرێتو ئەوەی دەیڵێت وەریدەگرم، هەندێ جاریش لە شێوەی پیاوێکدا، فریشتەکە دێتە بەرچاوم، قسەم لەگەڵدا دەکاتو منیش بەتەواوی تێدەگەم کەچی دەڵێت". بوخاری ڕیوایەتی کردووە،

ئەوەی لە ناوەرۆکی (وەحی)دا هاتووە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، لەگەڵ ئەو گوتارانە کەخۆی فەرموویەتیو بە (حديث) ناسراوە، جیاوازیان زۆرە لەڕووی داڕشتنو ناوەرۆکو بابەتەکانیانەوە. گومانی تێدا نییە کە پێغەمبەر بە (لفظ)و زمانی خۆی فەرموودەکانی فەرمووەو دەماودەم لێی بیستراوەتەوە، لەسەردەمی خۆیدا ئەم مەسەلەیە ئیشکالیەتێکی قوڵ نەبووە، چونکە بە ئاسانی ئەو دوانە لەڕووی داڕشتنەوە جیاواز بوون. لێرەدا قسە لەسەر ئەو بەشە جیاوازە ناکەم، چونکە ئەوە پرسیاری سەرەکیی ورۆژاندنەکانی (پێویست) نین.

ئاماژە بە ناوەرۆكو بابەتە قورئانییەکان دەکەم:

1. ناساندنی خواوەند بە مرۆڤەکان بە ناو (أسماء)و خەسڵەت (صفات)ی خۆی وەك خۆی لە قورئاندا باسی کردووەو سەلماندنی ڕۆژی ئاخیرەتو دونیای پەنهانو پەیامی پێغەمبەرانی ترو هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەر (ﷺ)و دنیای فریشتەکانو ...

2. ناساندنەوەی مرۆڤ بەخۆی وەك پرۆسەیەکی بەخۆداچوونەوەو زانینی پەیکەرو ناوەرۆك و بەهامرۆڤیو جێکەوتەی لە گەردوونو ژیانداو ئەو ئەركو مافانەی هەیەتی.

3. هەڵسەنگاندنی سیستەمەکانی سەرزەمین، ئاڕاستەکردنی ڕەخنەی بنەڕەتیی بەرامبەریان‌و هەڵسەنگاندنیان بە پێوەری سیستەمە ئاسمانییەکان، ڕەتکردنەوەی ئەو تەرزانەی لەگەڵ ئەو ئاراستەیەدا ناگونجێن‌و بنیاتنانەوەی سیستەمی بیرکردنەوەی مرۆڤ لەسەر بنەمای تاقانە خودایی‌و چەمکە پەنهان‌و دیارەکانی ئایین.

4. داڕشتنەوەی سیستەمی ڕەوشت‌و پەیوەندیی مرۆڤەکان بە خۆیانەوەو ڕێکخستنی کۆمەڵگاو دەسەڵاتەکان‌و ئاڕاستەکردنی هەڵسوکەوتی تاك.

لەپێناو بە ئەنجامگەیاندنی ئەم مەبەستانەدا، (نیگا)ی خواوەند بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، چەندین میکانیزم‌و ڕێوشوێن دادەنێت، کە بە شێوازی سرووشت هاوڕازن لەگەڵ ڕەوتی نیگاو ئامانجەکانیدا، بۆیە دەبێ ئەو میکانیزمانە بەو ئامانجانە بگەن کە ناوەرۆکی (نیگا) دیاریی دەکەن.

ئەم ئاستە بەرزە لە بەرنامەو پرۆگرامی ژیان‌و ڕێکخستنی کۆمەڵگا بەو ئاڕاستە بەرزەی قورئان باسی لێوە دەکات، دەبێ کەسێك بینووسێتەوە خاوەنی ژیریەك بێت لەسەرو گەورەیی گەردوونەوە، ئەمەش لە توانای موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلایەکی عەرەبی نەخوێندەوار دوورە، لەکاتێکدا کە زاتی خۆی دان بەم ڕاستییەدا دەنێت‌و ڕاستگۆیانە گوزارشت لە بێتوانایی خۆی دەکات، هاوکات قورئانی پیرۆز لەچەندین شوێندا ئاگاهی دەدات بە پێغەمبەری خودا (ﷺ)و پێی دەفەرموێت کە تۆ (بێئاگابوویت) (نەت دەزانی) (تۆ غەیب نازانی) (ئێمە فێرمان کردیت) (ئێمە تێرمان کردیت) ...هتد.

ئەوە تەنها خودایە دەتوانێ ئەو ڕەخنانە ئاڕاستەی پاکترین‌و ئەمیندارترین مرۆڤی سەر زەمین بکات. کە تا ئەو ساتەوەختە یەك عەرەب لەناو دوورگەی عەرەبیدا نەیتوانیوە بڵی بە موحەممەد تۆ (نەتزانی)، یان (نەتزانیوە)، هاوکات لەوەش زیاتر لەسەردەمی پەیڕەوکردنی پەیامی پێغەمبەریشدا خودای مەزن (جل جلاله) ڕەخنەی توند ئاڕاستەی پێغەمبەری خۆشەویستی خۆی دەکات، کەلەڕووی ڕەوانبێژی‌و زمانەوە ئەوەندە توندە، وەختە پێغەمبەر (ﷺ) بەرگەی نەگرێت. بڕوانە چۆن پێی دەفەرموێت (عبس وتولى، أن جاءه الاعمى..) واتە: ئەو (واتە موحەممەد) ڕووی خۆی گرژو مۆنکرد کاتێ کابرای نابینا هاتە لای. ئەوەندە ڕەخنەکە توندە بە گوتاری ڕاستەوخۆی کەسی دووەم ئاڕاستەی ناکات، بەڵکو بە گوتاری کەسی سێیەمی (بزر) ئاڕاستەی دەکات. ئەمەش ماناو ڕەنگدانەوەی قوڵی هەیە بۆ سەر دڵی پێغەمبەر (ﷺ)، دەکرێ مرۆڤ بەم دەستەواژەیە ڕەخنەی ئاوا توند لەخۆی بگرێت؟! ئەم دیمەنانە لە چەندین شوێنی تری قورئاندا دووبارە بوونەتەوە، ئەمە دژەوانەیە لەگەڵ بانگەشەی (پێویست)دا کە پێیوایە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا خۆی وەحی نووسیوەتەوە، ئەمە بێئاگاییە لەناوەرۆکی وەحی‌و قورئان.

دێمەوە سەر ڕەوتی کتێبەکەی (پێویست) کە دەڵێ "...جگە لەخوداکانی ئاسمان‌و سەرزەوی، چەندین ئەفسانەی دیکەی وەك فریشتەو جنۆکەو شەیتانەکانیان لەبیرو مێشکی خۆیاندا دروستکردبوو ..." (ل12، ئایا قورئان...). لە ڕاستیدا ئەم بیروباوەڕانە، عەرەب بۆ خۆیان دروستیان نەکردبوو، چونکە خەیاڵگەی عەرەب تەنها ڕۆڵی وەرگرتنی لەو شتانەدا دەبینی، ئەم بۆچوونە تێکەڵەیەکی ئایین‌و ئایینزاکانی تری وەك (صابئە)و (جولەکایەتی)و (گاورایەتی) بوون‌و عەرەبەکانیش شوێنی ئەوان دەکەوتن. کاکی نووسەر (جنۆکەو شەیتان)ی وەك دوو بوونەوەری جیاواز ناوبردووەو بە گۆترە قسە دەکات، لەکاتێکدا لە ئەدەبیاتی هەموو ئایینەکاندا شەیتان بە جۆرێك لە جنۆکە سەیردەکەن‌و پێیانوایە شەیتان چڵەپۆپەی خراپبوونی جنۆکەیە، ئەمەش جۆرێکی ترە لە بێئاگایی نووسەر، سەبارەت بە وردو درشتی کەلتووری ئایینیی، نموونەیەکی تری بێئاگایی نووسەر لە سەر کەلتووری ئایینیی ئەوەیە کە دەڵێ "یەحیا پێغەمبەری سابیئەکان بووە.." (ل15 ئایا قورئان...). لە ڕاستیدا ئەمە هەڵەیەکی زەقەو (یەحیا) یەکێکە لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل (کوڕانی ئیسرائیل)و یەکتاپەرستێکی مەزن بووە، سابیئەکانیش لە مێژووی کۆن‌و نوێدا باوەڕیان بە یەکتاپەرستیی یەحیا نەبووەو نییە!!.

سەبارەت بە ڕەوتی (حونەفا) کە (پێویست) پێ لەسەر ئەوەدا دەگرێت، گوایە "لەناو شاری مەککەو تائیف خەڵکیان هەبووە، ئەمانیش ڕەخنەیان لە بتپەرستیی گرتووەو بڕوایان بەیەکخواپەرستیی هەبووە"، پاشان دەڵێ "ئەمانە شارەزاییان لە ئایینەکاندا هەبووە" (ل15 ئایا قورئان...) بێئەوەی ئاماژەیەك بەیەکێك لەسەرچاوەکانی سیرە بکات.

لەمانەش سەمەرەتر ئەوەیە کە دەڵێ "پێغەمبەر پێش ئەوەی پێغەمبەرێتی خۆی ڕابگەیەنێت سەر بەئەم ڕەوتە بوو..". ئەم قسەیە لەهیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی، یان سیرەدا نەهاتووە، نووسەر ئەمەی لە کوێوە هێناوە؟، ئەوە خۆی دەیزانێت. نووسەر زیاتر لەسەر ڕستە بێبەڵگەکانی بەردەوامەو دەڵێت: "وەرەقەی کوڕی نەوفەل سەر بە ڕەوتی (حونەفا) بووەو شارەزاییەکی تەواوی هەبووە لە ئاییینەکانی ترداو بەشێك لە ئینجیلی وەرگێڕابووە سەر زمانی عەرەبی".

هەرئەوە ماوە بڵێ: وەرەقە چاپخانەیەکی هەبووە کتێبەکانی (حونەفا)ی بە چاپ گەیاندووە!!، ئەمە گاڵتەجاڕیە بە مێژوو سیرەو نووسینو بێڕێزی کردنە بەرامبەر بە کەسەکانی مێژوو. ئەوجا دێتو ڕستەیەکی بێبناغەی تر فڕێ دەدات "موحەممەد لەڕێگەی وەرەقەوە زانیارییەکی فراوانی لەسەر ئاییینەکانیتر پەیداکردووە" (ل15 ئایا قورئان...). ئەم دێڕەی لە نووسەری هەڵگەڕاوەی عەرەب (خەلیل عەبدولکەریم) وەرگرتووە کە ئەویش لە گیرفانی خۆی ئەم قسەیەی دەرهێناوە، ئەگەرنا لە هەموو سەرچاوەکانی سیرەدا باسی بەیەکگەیشتنی پێغەمبەر (ﷺ) بە وەرەقە تەنها یەکجاربووەو بە ئامادەبوونی خەدیجە بووە، لەو کاتەشدا چەند خولەکێك پێکەوە بوون. ئەمەش ڕیوایەتەکەیە (ئیمامی بوخاری) دەیگێڕێتەوە: "... ئەمجا خەدیجە چوو بۆ لای (وەرەقەی کوڕی نەوفەل)ی ئامۆزای، کە شارەزای ئینجیلی عیسا پێغەمبەر بوو، لەوکاتەدا پیرو کوێر بوو، موحەممەدیشی لەگەڵدا بوو، خەدیجە (خوا لێی ڕازی بێت) وتی: ئامۆزا گوێ بگرە لەم برازایەت بزانە چی بەسەرهاتووە؟، پێغەمبەر (ﷺ) بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، وەرەقەش وتی: ئەو پیاوە ئەو فریشتەیەیە کە مژدەی داوە بە پێغەمبەرێتی پێغەمبەرەکان، خۆزگە گەنج بوومایەو بمامایە تا ئەوکاتەی خزمەکانت دەریان دەکردی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بۆچی دەرم دەکەن؟ وتی: بەڵێ، هیچ پیاوێك نەبووە پێغەمبەرێتی هێنابێ و دوژمنایەتی لەگەڵدا نەکرابێت، ئەگەر بە ئەو ڕۆژە بگەیشتمایە یارمەتییەکی گەورەم دەدایت، بەڵام وەرەقە مردوو نیگاش وەستا"[1].

دوای ماوەی کەمتر لە مانگێك وەرەقە مرد، ئەوە یەکەمجارو دوایین جار بوو پێغەمبەر (ﷺ) ئەو پیاوە ببینێ، چوارچێوەی پرسیارەکانیش ڕوونە، کە بۆچیو چۆن بووە: ئیدی موحەممەد چۆنو کەیو بە چ شێوەیەك ئەم زانیارییە گەورەو فراوانەی لە وەرەقە وەرگرت؟. ئایا دەکرێ ئەم پاساوە بێسەروبەرە بکرێتە بەڵگەی بەدرۆزانینی ڕاستییەکی گەردوونیو گەورەی وەك پێغەمبەرێتی موحەممەد (ﷺ)؟، ئایا دەکرێ موحەممەد (ﷺ) لە ژیانیدا سڵاوی لە هەر کەسێك کردبێ، یان کەسێك میوانی بووبێت، یان ڕێزی لەکەسێك گرتبێ، خێرا (پێویست) وەك ئەبولەهەبو ئوم جەمیلی خێزانی بیکاتە هەراو بڵێ موحەممەد (ﷺ) قورئانەکەی لەوان وەرگرتووە؟ کاکی برا، ئەوە خەتای تۆ نییە، بەڵکو خەتای بلیمەتەکانی بەشی (چاودێری چاپەمەنی) وەزارەتی ڕۆشنبیری پێشوو (ئیدارەی سلێمانی)ی حکومەتی هەرێمی کوردستانە، کە دەبوایە قسەیەکی تریان لەسەر ئەم ڕستەو دەستەواژە بێماناو بێکەڵکانە بکردایە. ئەوەتا (پێویست) موحەممەد دەکاتە تاریبێژی ئەو شاعیرو ڕەوانبێژو زمان پاراوانەی کە هاوتەمەنی پێغەمبەر بوون (ﷺ)، وەك (قەیسی کوڕی ساعدە)و (ئومەیەی کوڕی ئەبی سلط)، دەیدا بە گوێی خوێنەردا کە موحەممەد (ﷺ) لەبەرئەوەی پورزای ئومەیە بووە ئیدی ماریفەتو ڕەوانبێژییو ئەدەبیاتی قورئانەکەی لەوان وەرگرتووە، بەڵام پرسیارە بێ وەڵامەکەی لێرەدایە: باشە کە ئومەیەو قەیسو وەرەقە ئەوەندە بلیمەتو گەورەبوون بۆچی خۆیان بانگەشەی ئەو پەیامبەرییەیان نەکردووە؟!! ئەی کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) بانگی پێغەمبەرێتی دا بەگوێی دەوروبەردا، بۆچی هیچ یەکێ لەو کەسانە نەیوت ئەوە لە شیعرەکەی من دەچێ؟" تەحەددایەکی بێسنووری (پێویست)و هاوشێوەکانی دەکەم ناوی یەك شاعیرم پێبڵێن کە وتبێتی (قورئان) لە شیعرەکانی من دەچێت؟، یان لە شیعری فڵانە شاعیر، یان فیسارە ڕەوانبێژ دەچێ؟. ئیدی دەبێ ئەوان لەبیریان چووبێت و کاکە (پێویست)ی بلیمەت بیریان بخاتەوە، کە پێویستە داوای مافی خۆیان بکەن لە موحەممەد، چونکە گوتەی ئەوانی نووسیوە! ئەگەر (پێویست) پێیوایە مەڵۆیەکی نوێی هێناوە، ئەوە دەبێ بیخاتە سەر شاراکەی ئەبوجەهلو ئەبولەهەب و ئوم جەمیلی هاوسەری، خۆ ئەگەر قەیسو ئومەیەش لە ژیاندا بوونایە بەدەمی خۆیان ئەم قسانەی (پێویست)یان

[1] مناع القطان، مباحث في علوم القرآن، چاپی (11) ساڵی (2000)، مكتبه الوهبة، لاپەڕە (81–89)و (130–145).

بەدرۆدەخستەوە، پێغەمبەر (ﷺ) بێ شەرمکردن دەیان بەیتی (شیعری)ی لەبەربووە، فەرمووشییەتی کە ئەمانە شیعرەکانی ئومەیەن!، زۆر سەیرە، کە پاش (1430) ساڵ، نووسەرێك پەیدا بێ، لەجیاتی (وەرەقەو قەیس‌و ئومەیە)و بنەماڵەکانی ئەوان قسە دەکات، بەرامبەر بە کێ؟ بەرامبەر بەو چیا گەردنکەشەی شاعیرانی هەموو عەرەب‌و زمانزان‌و ڕەوانبێژەکانیان، بەرێزەوە سەیری موحەممەدیان (ﷺ) کردووەو بڕوایان پێهێناوە.

کەلتووری عەرەبی جاهیلی، کەلتوورێکی دەوڵەمەندە لە شیعرو ئەدەب‌و ڕەوانبێژییدا، هەموو ئەو بەرهەمانە بەتایبەتیی ئەوانەی شاکاری ئەدەبیین، ماونەتەوەو ئێستا وەك بەشێك لەئەدەبی سەردەمی جاهیلی سەیریان دەکرێت‌و خاوەنی هەر پارچەیەکی ئەدەبیی دیارەو شاراوە نییە، کەلتووری قەیس‌و شیعرەکانی ئومەیەی کوڕی ئەبی سلط، هەتا ئەمڕۆ ماون، هەموو تایبەتمەندانی بواری زمان‌و ئەدەبی عەرەبی، شیعرو بەرهەمی شاعیرەکان دەناسن، وەك چۆن بەرهەمی ئەدەب‌و شیعری شاعیرە گەورەکانی کورد دیارن، (پێویست) بەسەر ئەو هەموو شاکارە بەرزانەدا باز دەدات‌و لەهەگبەی ئەو شیعرانە وشەو ڕستە دەخوازێت‌و دەچرپێنێ بە گوێماندا، کە گوایە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا لەم کەسانە سوودی وەرگرتووە. بەڵام بەرهەمی هیچ یەکێ لەو کەسانە بەناوی (پێغەمبەرێك)وە ناوزەد نەکراوە، هاوکات هەروەکو (پێویست) دەڵێ: "پێش پێغەمبەر (ﷺ)، نوح‌و هودو چەندین پێغەمبەری تر بانگەشەی پێغەمبەرێتیان کردووە". ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کە (پێویست) ئەو پرسیارە گرنگە لەخۆی بکات: بۆچی ناوی (نوح‌و هودو موحەممەد) وەك پێغەمبەر مایەوە، کەچی ئەوانی دیکەی وەك (موسەیلەمە)، بە مرۆڤی درۆزن‌و ساختەچیی ناو مێژوو، ناوبانگیان دەرکرد؟ وەڵامەکەی بە سادەیی ئەوەیە ئەوان پێغەمبەربوون، موسەیلەمەو هاوڕێکانیشی درۆزن بوون. ناکرێ مرۆڤ هەڵگری کۆمەڵێ سیفات‌و خەسڵەت بێ و ئەم خەسڵەتانە لەمەودای ژیانی ئەو کەسەدا هەمیشە ونبن، ڕۆژێ لەڕۆژان هەر دەردەکەون بۆ خەڵك، پێغەمبەرێتی موحەممەد (ﷺ) بەشی هەرە گرنگی کەسێتی موحەممەدە، لەگەڵی ئاوێتەیەو لێی جودا نابێتەوە، دەیان‌و سەدان‌و هەزاران مرۆڤی بەدەوردا بوو، لە شوانەوە هەتا شاعیرو زمانزان‌و بیرمەندانی ڕۆژگاری خۆی، دۆست‌و دوژمن، نزیك‌و دوور، ئەمانە هەمووی چاودێری ئەو زاتەیان کردووە، کەسێك لەوانە نەیتوانیوە ڕێز لەگەورەیی‌و ڕاستگۆیی ئەو مرۆڤە نەگرێ، کەچی موسەیلەمە بەهەموو تەمەنی بانگەشەکەی ساڵێکی نەخایاند، لە ڕۆژگارێکدا کە مرد کەسێك نەیوت موسەیلەمە مرد پێغەمبەر بوو، جگە لەم پیاوە بلیمەتەی لەمەڕ خۆمان (پێویست)!! وا دەزانم ئەو ڕستانەی (پێویست) ڕیزی کردوون مێشك‌و هزری خوێنەر شەکەت‌و هیلاك دەکەن، بەو حوکمەی کە بێماناو بێبەڵگەو دژەوانەو تێکەڵ‌و پێکەڵن‌و لە داڕشتنی بەڵگەی مێژوویی‌و سەنەدی سیرەوە دوورن، ڕیزکردنی ئەو ڕستانەش هونەرێکی ئەوتۆی تێدا نییە، بەڵگەیەکی تری بێئاگایی نووسەر ئەوەیە کە دەڵێ "موسەیلەمە کە لەسەردەمی موحەممەددا جاڕی پێغەمبەرێتیدا یەکێك بووە لە حونەفا"!!. ئەم هەموو قسە بێسەروبەرانە بۆ ئەوەیە پێمان بڵێ: موحەممەد وەحی بۆ نەهاتووەو لە (حونەفا)وە وەریگرتووە. بۆ خەمی دڵی (پێویست) ئەو ئاواتەی نەهاتووەتە دی، مەگەر بۆ کەسێکی بێئاگای وەك خۆی لە (دین)و مێژوو، ئەمەش بۆ ئەو حاڵەتانە ئەستەم نییە. کێشەی (پێویست) لەوەدایە ناتوانێ، یان نایەوێ لە دەرەوەی ئایدۆلۆژیای خۆی بیر لە موحەممەدو قورئانی پیرۆز بکاتەوە، بە بڕیارێکی پێشوەختەوە قسە لەسەر پێغەمبەری مەزن دەکات. بریا بۆ ئەوو هەر کەسێکی دیکە بلوایە لە کەش‌و هەوایەکی سرووشتی‌و بێ ڕق‌و کینەدا توێژینەوە لەسەر قورئان بکەن، ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) موتالا بکەن، بێگومان ئەوجا هەڵوێستێکی دیکەیان دەبوو، لەوەش بێگومانی دەکەم کە ئەو نووسینەی ئەو، لەگەڵ ئەو هەموو خۆماندووکردنەدا، هیچ کاریگەرییەکی لەسەر عەقڵ‌و فیکری گەنجی مسوڵمان نییەو نابێ، خۆ ئەگەر پەیامێکی دیکەی هەیەو دەیەوێ ئەنتی ئایین‌و دژە ئیسلام وەك ئاڕاستەیەك هەبێ، بێگوێدانە ئاکامەکەی. ئەوەیان مەسەلەیەکی دیکەیەو پێویستە بزانێ کە لە پرۆسەی لەدەستدانی خۆشەویستێکی وەك موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلادا (ﷺ) ئەو قازانجێکی ئەوتۆ ناکات‌و کۆمەڵگاش خاڵی دەبێ لەهەموو ئەو بەهاو وێنە جوانانەی موحەممەد (ﷺ) پێشکەش بە کۆمەڵگای مرۆڤی کردووە.

(پێویست) بەم کارەی شەڕ لەگەڵ ڕاستگۆیی‌و داوێن پاکیی‌و خوداناسیی‌و ڕاستیی‌و پایەداریی مرۆڤدا دەکات، کە ئیسلام بۆ کۆمەڵگای ناردووە. دەبێ لەوە تێبگات کە ئەو شەڕە بۆ ئەو ئاکامێکی دۆڕاوی هەیە، بەهاکانی ڕەوشت‌و

بنەماکانی دامەزراندنی بەهای شارستانییەت و پێشکەوتنی مرۆڤ لە قۆناغەکانی مێژووەوە هەتا ئەمڕۆ، موڵکی ئایینەکانە، بەتایبەت ئایینی ئیسلام، کە تەواوکەری دواین خشتی دیواری کۆشکی ڕەوشتە، بۆیە شەڕکردنی (پێویست)، شەڕە لەگەڵ ئەو کۆشکە گەورەو پڕ لە مانایەدا، هەرلێرەشەوە ئاکامی ئەو شەڕەی (پێویست) دیارو ڕوونە.

(پێویست)، پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە پێش موحەممەد (ﷺ) کەسانی دیکە لەناو دوورگەی عەرەبییدا هەبوون و "دیاردەی پێغەمبەرێتیش ببووە دیاردەیەکی ئەو سەردەمە، وەڵامی کەسانێکی هۆشیاری ئەو سەردەمە بووە بۆ ئەو هەلومەرجە مێژووییە دیاریکراوە، کە بیری مرۆڤ ئەوەندە گەشەی نەکردبوو"، پاشان بێگرێ و بە سادەیی پێمان دەڵێ "... دیاردەی ئایین و پێغەمبەرایەتی بەرهەمی بیری مرۆڤە، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە لە قۆناغێکی مێژووی کۆمەڵایەتییدا" (..ل2 ئایا قورئان...) بەپێی ئەو قسەیەی (پێویست) بێت، کەواتە (وەرەقەو قەیس و ئومەییەو موسەیلەمەو ..هتد) هەموویان پێغەمبەربوون، یان ئەی بۆچی کەسێکی وەک وەرەقە عەقڵی بەوە نەشکا کە (پێویست) باسی دەکات؟، یان لەبیری نەبوو؟، ئەی دوای پێغەمبەر (ﷺ) بۆچی کەسێکی دیکە باسی لەو مۆدێلە نەکرد کە (پێویست) دەیخاتە ڕوو بۆ سەلماندنی نا ئاسمانیی بوونی (وەحی)؟!، مەگەر ئەم بۆچوونە چەند لە مێشک و ئاوەزی (پێویست)دا بۆتە قەناعەت و بڕوا، هەتا کەسانی دیکە متمانەی پێبکەن؟، کێشەی سەرەکی ئەم لێکدانەوانەی (پێویست)، ئەوەیە کە ڕستەو مەنهەجی لێکدانەوەکەی پەیوەندیی بە دیدگای ئیسلامەوە نییە، نووسەر بەکەرەستەو مەنهەجی (ماتریالیزمی دیالەکتیک) باسەکان شیتەڵ دەکات، لەهەموو ئەنجامەکانیشدا ئەگاتە یەک بەرەنجام، ئەویش بە (مێژووکردنی دیاردەی نیگا)یە، وەک بەشێک لە قۆناغەکانی مێژووی مرۆڤ و پێداویستییەکی ئەو کاتەو نەفیکردنی وەحی، وەک دیاردەیەکی ئاسمانیی، بەم کارەش (پێویست) بەبڕوای خۆی ئامانجی خۆی پێکاوە، کە توانیویەتی قورئان و پەیامەکەی موحەممەد (ﷺ) بئاخنێتە نێو هەوڵەکانی مرۆڤ و مافی ئاسمانی بوونی لێبسەنێتەوە، ئیدی دواجار بە دەنگی بەرز بڵێ: خەڵکینە ڕاستە موحەممەد بلیمەتێکی گەورەو ڕیفۆرمیستێکی مێژوو بووە، بەڵام پێغەمبەر نەبووە. هەر لە سەرەتای کتێبەکەوە ئەم ئاماژەیە دەدات و لەلاپەڕە (20)و چەندین لاپەڕەیتردا ڕاشکاوانە، ئەم بڕوایەی خۆی بۆ خوێنەرو وەزارەتی ڕۆشنبیریی دەخاتە ڕوو. ئەو بۆ خۆی ئازادە باوەڕی بەهەرچییەک هەبێ و هەر شتێکی دیکەش ڕەت بکاتەوە، بەڵام بیەوێ بەناوی ڕەخنەو هەڵسەنگاندنی زانستی و مێژووییەوە ئەم بۆچوونانە بسەلمێنێ، ئەوەبێگومان بەهەڵەداچووە، نەک لە کتێبەکەیدا ئەوەی بۆ نەسەلماوە، بگرە ئیسپاتی کردووە کە لەمێژوو سیرەو کەلتووری ئیسلامییشدا، مرۆڤێکی هەژارەو جێگەی بەزەییە!!.

تا ئێستا بەشێکی بۆچوونەکانی (پێویست)مان هەڵسەنگاند، لەژێر ڕۆشنایی سەرچاوەکانی سیرەو مێژوو فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسلامدا (ﷺ)، لە کۆتایی ئەم بەشەدا نووسەر ئاماژە دەکات بۆ هەندێ دیاردە لە ژیانی پێغەمبەر (ﷺ)، وەک دابەزینی نیگاو دابڕان و دڵەڕاوکێ و نائومێدبوون و ئاڵۆزبوونی لایەنی دەروونیی پێغەمبەر (ﷺ). سەرجەم ئەم باسانە لە کتێبەکانی مێژووی (قرطبی)و سیرەو سەرچاوەکانی تری سیرەدا باسیان کراوە، بەڵام لەم باسانەشدا، نووسەر نەگەڕاوەتەوە ئەو سەرچاوانەو ڕاستەوخۆ لەوانەوە وەریبگرێت، بەڵکو لە کۆمەڵێ نووسەری چەپ و دژە ئایینی وەک (ئارام ڕەشید)و (عەلی دەشتی)و (عەباس عەبدولکەریم) وەریگرتووە کەناوی خوازراوی (فواد مەجید میسری)یەو هەموو ئەوانە ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ دژ بە ئیسلام و سیرەی پێغەمبەر (ﷺ)و مێژووی گەلانی مسوڵمان نووسراوی خراپیان هەیەو لە پۆلێنی نووسەرە باوەڕپێکراوەکانی سیرە و مێژوودا نین!، ئەمەش دیوێکی تری بێئاگایی و بێحەوسەڵەیی ئەم نووسەرەی لەمەڕ خۆمان نیشان دەدات، بەڵام لە کۆتایی ئەم بەشەدا خاڵێک دەوروژێنێ، کە پێویستە قسەیەکی لەسەر بکەم.

نووسەر لە لاپەڕە (27)دا دەڵێت "تەنها گۆڕانێک لە شێوەی کارو تەبلیغاتی موحەممەدی پێغەمبەری ئیسلامدا ڕوویدا. ئەویش ئەوەبوو کە بیروبۆچوونەکانی کرد بەناوی خودای نادیارەوەو مۆری ئاسمانی لێدان". لە ڕاستیدا تەنها خاڵێکی ئەم ڕستەیە کەڕاست بێ (خودایی بوون و ئاسمانی بوون)ی وەحیە، بەڵام پێش بانگەشەی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ). کامەیە ئەو بزووتنەوە ڕیفۆرمیستییەی (حونەفا) دەستیان پێکردووەو لە موحەممەددا کۆتاییهاتووە؟، لەهەموو دوورگەی عەرەبییدا هەتا یەکەم سەدای بانگەوازی موحەممەد (ﷺ) بۆ کۆبوونەوە بەدەوری قورئاندا، یەک مرۆڤی ڕیفۆرمخواز نەبووە

بانگەشە بکات بۆ گۆڕینی ئەو واقیعی حاڵەی هەیە، ئەو هەڵوێستانەی وەك (حلف الفضول) هەڵوێستی سنووردداربوون و خاوەن دیدێکی نوێ نەبوون بۆ گۆڕینی سەرجەم بۆچوون و پەیوەندیی و ژیانی گشتیی خەڵك، ئەگەر (پێویست) کەمێك خۆی ماندووبکردایەو لە سەر ئایەتەکانی سەرەتای دابەزینی وەحی بوەستایە، تێدەگەیشت کە قورئان لە گوتارەکانی خۆیدا قسە لەسەر سیستمێکی نوێی جیهانیی دەکات. مرۆڤی کۆمەڵگای عەرەبی لەوانەیە چاوی لەدەستی سەرانی قوڕەیش و مەوسیمی حەج و مانگە حەرامکراوەکان بووبێ بۆ خۆدۆزینەوەو ڕزگاربوون لە برسێتی و زوڵم و ستەم و هەندێ پرسی سنووردار لەناو شاری (مەککە)و دەورووبەریدا، بەڵام کە سەیری گوتاری قورئان دەکەیت، لە پانتاییەکی گەورەتر لە ئاسۆی شاری مەککەو بگرە دوورگەی عەرەبییشدا قسە دەکات. مرۆڤ دەبێتە باسی یەکەم، زانست، خوێندن، فەزیلەتی خوێندن، ڕێزگرتن لەمرۆڤ، باسی ئاخیرەت، بوونی خواوەند، خوداشوناسیی، دیمەنەکانی ڕەستاخێز.... سەرجەم گوتارەکە بارگەگری چەمکی ئایینییەو دەیەوێ بەو دیدگایە دنیای مرۆڤ بگۆڕێت، ئەمەش سیفەتێکی هەمیشەیی و بەردەوامی، قورئانە لەسەردەمی مەککەو قۆناغی مەدینەشدا، لەناوچەکەدا شتێك نەبووەو قورئان درێژەی پێبدات، ئەم جۆرە بۆچوونە هەڵەیەو بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر بێئاگایی بوونی خاوەنەکەی لەسەر قورئان و قۆناغەکانی دابەزینی وەحی و گۆڕانکارییەکانی ئەو سەردەمە. سەبارەت بە ڕەوتی (حونەفا)ش کە نووسەر زۆرجار پێی لەسەر دادەگرێت، لەڕاستیدا لەناو مەککەو دەورووبەریدا، چەند کەسێك هەبوون باوەڕیان بە بتپەرستی نەبوو، ئەم خاڵە تەنها خاڵی هاوبەشی نێوانیان بوو، کەسانی تریش هەبوون لەسەر ئەم ڕەوتە نەبوون و باوەڕیشیان بە بتپەرستی نەبووە، لەوانە خودی پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەها ئەبوبەکری صدیق، (ڕەزای خوای لێبێت)، هاوکات (حونەفا)، یان (حەنەفیەت) لەناو مەککەو دوورگەی عەرەبییدا ڕەوت نەبوو، دیاردەش نەبوو، هاوکات دیدێکی ڕۆشن و بزووتنەوەیەکی ڕیفۆرمی سنووردداریش نەبوو، بەڵکو چەند حاڵەتێکی فەردیی و تەنها کەسیی بوو، خاوەنی پرۆگرامێکی دیاریکراو نەبووە، هەتا (نووسەر)، یان هەرکەسێکی دیکە قسە لەسەر ئەوە بکەن کەچەند لەگەڵ ڕێبازی نوێی موحەممەددا لەیەکچوون هەبووە لەنێوانیاندا؟!، بۆیە کە نووسەر باس لە ڕەوتی (حونەفا) دەکات. باس لەڕەوتێك دەکات کە لە مێژووی دوورگەی عەرەبییدا نەبووەو هەڵچنی نووسەرو سەرچاوەکانییەتی، کە لە هیچ سەرچاوەیەکی سیرەو مێژوودا باسی لێوە نەکراوە.

## گفتوگۆ لەسەر بەشی دووەمی باسەکە

نووسەر ئەم بەشەی تەرخانکردووە بۆ قسەکردن لەسەر خودی قورئان و پێکهاتەکانی و ناوەڕۆکەکەی و بابەتەکانی و سەرچاوەکانی (!!)، نووسەر لەم بەشەدا بۆ مێژوو ئاماژەی بۆ سەرچاوەیەکی متمانە پێکراو کردووە کە کتێبی (مباحث في علوم القرآن)ی (مناع القطان)ە، ئەویش لەچەند بڕگەیەکی خوازراوی تایبەتدا، هاوکات لەپەراوێزەکانیداو لە لاپەڕە (57) بە ژمارەی (22)، پەراوێزێکی داناوە بۆ کتێبی (أسباب النزول)ی (نیسابوري) کە بێگومانم لەوەی نووسەر لەبنەڕەتدا ئەو کتێبەی نەدیوەو ناشزانێ باسی چی دەکات، چونکە ئەوە کتێبێکی دەگمەنی کۆنەو لە کتێبخانەکانی کوردستاندا زۆر کەمە، مەگەر (پێویست) لە "کتێبخانە"کەی خۆیدا ئەوەی هەبێ!!، ئەوەش مەحاڵە، چونکە لەبنەڕەتدا نووسەر سەرچاوە ئیسلامییەکان ناناسێ و ئاشنایەتیشی نییە لەگەڵیاندا، چ جای ئەوەی سەرچاوەیەکی وەك (أسباب نزول)ی نەیسابووری!!! بەهەرحاڵ دێمە سەر ناوەرۆکی ئەم بەشە.

لەسەرەتادا نووسەر هەندێ زانیاری دەربارەی قورئان دەخاتە ڕوو:

لە لاپەڕە (30 – 34) سەرجەم لە (مباحث في علوم القرآن)ی (مناع القطان) وەریگرتووە، بەدەرهاویشتنی هەندێ دەستەواژەو ڕستە کە پەیوەندیان نییە بەو کتێبەوە وەك (قورئان داڕێژراوە)و (قورئان نووسراوە) کە ئەم ڕستانە دەستنووسی خۆیەتی و ئاماژەیە بۆ بیروباوەڕی نووسەر سەبارەت بە قورئان، لەلایەکی دیکەوە کە نووسەر ئەو زانیارییانە لە (مناع القطان) وەردەگرێت، ئەو دەستەواژەی (نزول) بەکاردەهێنێت، بەڵام پێویست دەستەواژەی (نووسینەوە) بەکاردەهێنێت، بەو مانایە قورئان دانەبەزیوە، بەڵکو نووسراوەتەوە، ئەمەش لە بنەڕەتدا وەرگرتنێکی ناڕاستەو دژەوانەیە لەگەڵ باری وەرگرتنی زانیاریدا لەهەر سەرچاوەیەکی ترا!.

لەلاپەڕە (35)دا نووسەر ئاماژە بۆ ئەو سەرچاوانە دەكات كە گوایە لە نووسینەوەی قورئاندا موحەممەد سوودی لێوەرگرتوون!.

لەونێوەندەدا نووسەر ئاماژە بۆ (ئاڤێستا)و (تەورات)و (ئینجیل) دەكات كە ڕۆڵیان هەبووە لەداڕشتنەوەی قورئاندا!!

بەپێی گێڕانەوەی نووسەربێت، دەبێ بەلایەنی كەمەوە پێغەمبەری ئیسلام شارەزایی تەواوی لەسەر ئاڤێستاو تەورات‌و ئینجیل بووبێت، لەكاتێكدا كە هەتا ئەمڕۆ نووسخەیەكی ئاڤێستا لە هەموو دوورگەی عەرەبییدا نییە، لەناو مەككەشدا هەتا چەند سەدەیەكیش دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) نووسخەی تەورات‌و ئینجیل لەناو مەككەو دەورووبەریدا نەبووە، جگە لە شاری مەدینەو دەورووبەری كە جولەكەو نەسرانییەكانی تێدابووەو لە قۆناغی مەدینەدا پێغەمبەر(ﷺ) گفتوگۆی لەگەڵدا كردوون. لەمانەش سەیرتر ئەوەیە، كە خاوەنەكانی تەورات‌و ئینجیل ئەو تۆمەتەیان نەداوەتە پاڵ پێغەمبەر كە لەژێر كاریگەریی ئەواندا بووبێت، بەپێچەوانەوە هەمیشە پرسی ئەوەیان هەبووە كە بۆچی هەموو ئەحكامەكانی قورئان دژەوانەن لەگەڵ ئەحكامی تەورات‌و ئینجیلدا؟!.

لێرەدا (پێویست) لەجولەكە جولەكەترەو لە گاوران گاورترەو چووتە سەرو حەزەكانی ئەوانیشەوە، تەنها بەڵگەش ئەوەیە كە "هەندێ لە ئەحكامەكانی قورئان لەناوەڕۆكی هەندێ بەسەرهاتی ئەو كتێبانە دەچێ". پێش تەورات‌و ئینجیل، دەمەوێ باسی ئاڤێستا بخەمە دەرەوەی باسەكە، چونكە نووسەر بۆ كۆكردنەوەی ناوی كتێب دایناوە، سەبارەت بە باسەكانی قورئان كە نووسەر دەڵێ لە تەورات‌و ئینجیل دوورن.

نووسەر دەڵێ: "كەسێك بەوردی قورئان بخوێنێتەوە، باس‌و بابەتەكانی لەگەڵ هەندێك لە كتێبە ئایینییەكانی پێش ئیسلام وەك (ئاڤێستاو تەورات‌و ئینجیل) بەراورد بكات، ئەوەی لا ڕوون دەبێتەوە كە داڕشتنی ئایەتەكانی قورئان، نەك هەر لە ژێر كاریگەریی باس‌و بابەتەكانی ئەو ئایینەدایە، بەڵكو گەلێك لە داستانەكانی قورئان، ڕێوڕەسم‌و نەریتەكان‌و هەندێك لە بڕیارو حوكمەكانی قورئان بەوەستاییەوە لەوان وەرگیراون" (ل35 ئایا قورئان....). بە چ بەڵگەیەك ئەم قسانە دەكات؟

1. بوونی شوێنەواری ئەو ئایینانە لەنیمچە دوورگەی عەرەبییدا.
2. لە یەكچوونی داستان‌و ڕێوڕەسمەكان لەنێوان هەردوولادا.
3. لەیەكچوونی ئەحكام‌و شەریعەتەكان لەیەكتر.
4. كەسانی نزیك هەبوون كاریگەرییان هەبووە لەسەری.

سەبارەت بە خاڵی یەكەم: ئاسەواری ئەو ئایینانە لە دوورگەی عەرەبییدا تایبەتە بە جولەكەو گاورەكان، جولەكەكان لەناو مەدینەو دەورووبەریدا بوون، گاورانیش لەناوچەی نەجراندا بوون‌و تەماسی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا نەبووە، دوای بڵاوبوونەوەی ئیسلامەتی لە ساڵی شاندەكان (عام الوفود)، كە كۆتاییەكانی ژیانی پێغەمبەرە (ﷺ) هاتنە خزمەتی، لە چەندین وەفد پێكهاتبوون بۆ حیوارو گفتوگۆی (نبوة)و مەسەلەی ئایینەكان هاتبوونە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) پێش ئەو ڕۆژە پێغەمبەری خوا لەسەردەمی كامڵبوون‌و بانگەشەی پێغەمبەرێتیدا هیچ زانایەكی گەورەی نەدیوە، جگە لە (بوحەیرا) كە پێشتر ئاماژەكان پێكرد، لەتەمەنی (12)ساڵیدا بووەو لەساتەوەختی كەم‌و خێرادا، حیوارەكەش لەهەموو كتێبەكانی سیرەدا تۆماركراون. ئیتر دەبێ بزانین بوونی ئاسەواری ئایینی گاورایەتی چ دەورو كاریگەرییەكی هەبووە لەسەر عەقڵی پێغەمبەر (ﷺ)!. سەبارەت بە ئایینی جولەكەش، لەوساتەوە جولەكە زانیان كە پێغەمبەری دوایین زەمان لەقەومی جولەكە نییە، جگە لە دژایەتی كردن‌و هەوڵی پلان‌و ناشیرنكردنی پێغەمبەر (ﷺ)و پەیامەكەی، بەهیچ شێوازێك بە ئیجابیی مامەڵەو حیواریان لەگەڵ پێغەمبەردا نەبووە، مێژووی مامەڵەی جولەكەو شەڕەكانی (بەنی قەینوقاع)و (بەنی نەزیر)و (بەنی قورەیزە)و جولەكەی (خەیبەر)، باشترین بەڵگەن لەسەر ناڕاستیی قسەكانی (پێویست)، پەیوەندییەكە پەیوەندییەكی ململانێ بووە. نەك لەیەك وەرگرتن، جولەكە پێیوابووە كە دەبێ دوایین پێغەمبەریش لەوان بێ، تا ڕوداوی وەرگێڕانی (قیبلە)ش ئەو ئومێدەیان مابوو، دوای ئەوە جولەكە وازیان لەو خەونەش هێنا.

(پێویست) نەیتوانیوەو ناشتوانێت تەنها یەك ڕستەی لەیەكچوو بهێنێت لەنێوان ئیسلامو ئایینی جولەكەدا، ئاماژەدان بە چیرۆكو داستانەكانی (ئیبراهیمو موساو یوسفو لوط و عیسا) سەلامی خوایان لێبێت، بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی موحەممەد ئەم زانیارییانەی لەوان وەرگرتووە، بەڵكو بەڵگەیە لەسەرئەوەی هەموو ئایینەكان یەك سەرچاوەیان هەیە، كە لەلایەن خودای مەزنەوە بۆ مرۆڤایەتی هاتوون. خودی پێغەمبەر (ﷺ) جەخت لەسەر ئەو ڕاستییە دەكاتو خۆی بەدانەری دواین خشتی كۆشكی (نبوة)دادەنێت، كە پێشتر پێغەمبەرانی وەك نوحو ئیبرهیمو موساو یوسفو پێغەمبەرانیتر سەلامی خوایان لەسەر بێت درێژەیان پێداوە. ئەم ڕاستیە شاراوە نییە، لە قورئانی پیرۆزیشدا ئەم ئاماژانە هەن (نزل عليك الكتاب بالحق مصدقا لما بين يديه وانزل التوراة والانجيل) آل عمران 3، واتە ئەی موحەممەد (ﷺ) ئێمە ئەم كیتابەمان بەڕاستی ناردووە بۆ تۆ، متمانە پێدەری تەوراتو ئینجیلیشە. هەروەها ئایەتی ژمارەی (92) سورەتی (الانعام) (وهذا كتاب أنزلناه مبارك مصدق الذي بين يديه) واتە: ئەم كتێبە كە قورئانە، ئێمە دامان بەزاندووە، پیرۆزە، متمانە پێدەری هەموو ئەوانەیە كە لەبەردەستیدایە. شایانی وتنە كە پێویست ئەم دوو ئایەتە بەبەڵگە دەهێنێتەوە بۆ پاڵپشتی قسەكانی خۆی، لەكاتێكدا سەرجەم قسەكانی ئەو پوچەڵ دەكەنەوە!!.

بۆ زیاتر جەختكردن لەسەر ئەم خاڵە، نووسەر چەند نموونەیەك دەهێنێتەوە بۆ كاریگەریی ئەو ئایینانە بەسەر قورئانەوە، تەنها ئەم نموونەیەش بەسە بۆ شیتەڵكردنی مەنهەجی هەڵێنجانی نووسەر كە دەڵێت: "قورئان لەم تەسدیقكردنەدا بۆ تەوراتو ئینجیل، مەبەستی وتنەوەو لاساییكردنەوەی بیروبۆچوونەكانی ئەوانە، تا ئەو ڕادەیەی كە خۆی بەتەواوكەری ئەوان دەزانێت" (ل36 ئایا قورئان ..). ئەم هەڵهێنجاندنە نامۆو سەیرەی نووسەر لەبەردەم ڕاستییەكدا ڕامان دەگرێت، لەلایەكەوە نووسەر باوەڕی بە هیچ كتێبێكی ئاسمانیی نییە، لەلایەكی دیكەوە لاسایی تەوراتو ئینجیل دەكاتەوە -بێئەوەی بەڵگەیەكی هەبێ-، ئەی بۆخۆی پێیوایە كە تەورات و ئینجیل لەبنەڕەتدا پێش دەستكاری كردنیان، لەكوێوە هاتوون؟ نووسەر وەڵامی ئەم پرسیارەی پێنییە، هەنگاوی یەكەمی ئەو لێرەدا ئیسپاتكردنی (نائاسمانی) بوونی قورئانە، بۆ ئەو مەبەستە چەند نموونەیەكی تر دەهێنێتەوە، ئاماژەیەكی خێرایان پێدەدەین:

. باسی ئادەمو حەوا، نووسەر ناویان دەنێ (ئەفسانە) ل36

. داستانی ئیبراهیمو موساو یوسفو هۆزی لوط ل37

لە ڕاستیدا ئەم باسانە لەهەرسێ ئایینەكەدا باسیان هاتووە، لەگەڵ بوونی جیاوازییەكی گرنگ لە قورئانی پیرۆزدا كە بریتییە لە تەكنیكی داڕشتنو فەلسەفەو جوغزی چیرۆكەكانو ڕۆڵی ئەكتەرە ڕاستەقینەكان لەو چیرۆكانەدا كە قورئان بەشێوازێك باسیان دەكات، وێنەی ڕاستەقینەی كەسی پێغەمبەرانو كەسایەتییەكانی ترەو كەمتر لەسەر حیكایەتو برگەی ڕۆژو مانگو ساڵەكان دەوەستێ. هاوكات حەرەكەتو بانگەوازو تەرزی خستنەڕووی مەنهەجی خوداوەند بۆ مرۆڤو بنیاتنانی كەسەكانی لەناو بەسەرهاتەكاندا، وێنەیەكی ڕووتەو لەهەموو كتێبەكانی تردا وێنەكان ئەو مانەیە نادەن بەدەستەوە. نووسەر لەم ڕاستییە بێئاگایە، بە حوكمی ئەوەی كە خۆی وەك كەسێكی هۆشیار قورئانی نەخوێندووتەوەو لەسەر ئەو ڕاستییانە نەوەستاوە، تەنها ئەركی گواستنەوەو وەرگرتنی قسەو باسی خەڵكانی دیكەیە، بێگوێدانە ناوەڕۆك و میسداقیەتی قسەكان.

بۆ نموونە: لە داستانی عیسادا (عليه السلام)، جولەكە بە ڕۆڵەی زۆڵ سەیری دەكەنو دەڵێن حەرامزادەیە، لەكاتێكدا لەبەرپەرچی ئەو هەڵوێستە ناشیرینەدا، مەسیحییەكان دەڵێن (عیسا) كوڕی خودایەو بەشێكە لە ئەو، هاوكات خۆشی ڕەنگدانەوەی خودایە لەزەویدا، لەكاتێكدا كە قورئان دەفەرمووێت: عیسا مرۆڤەو نەجیبزادەیەو مەریەمی دایكی داوێنپاكترین مرۆڤی سەرزەمینەو خۆشی پێغەمبەری خودایەو هەڵگری پەیامی ئاسمانە، چۆن ئەم سێ گێڕانەوە لەیەك دەچن؟!!! بە عەقڵو سەلیقەی كێ (عیسای حەرامزادەو عیسای كوڕی خوداو عیسای پێغەمبەر) لەیەكدەچن؟!!. ئەمەیە عەقڵو لێكدانەوەی (پێویست)؟!!. لەهەموو بەسەرهاتو داستانەكانی تردا جیاوازییەكان گەورەو سەرەكین، بەڵام كەسێتییەكان وەك ناوو شۆرەتو ڕووداوو برگەی مێژوویی باسیان دووبارەبووەتەوە، بە حوكمی ئەوەی هەرسێ ئایینەكە لە دەبیاتی خۆیاندا وەك سەرچاوەیەكی ئاسمانی باسیان لێوە كردووە، هاوكات وەك ڕاستییەكی مێژوویی، لەهیچ

قۆناغێکی مێژوویيدا پێغەمبەری ئیسلام بەکەسێکی (جوو)، یان (گاور) نەگەیشتووە کە باسی ئەم شتانەی بۆ بکات، ئیدی (نووسەر) بە چ بەڵگەیەك دەیسەلمێنی کە قورئان لاسایی کردنەوەی تەورات و ئینجیلە؟.

نووسەر لەسەر پێکچواندنەکانی بەردەوامەو هەرجارەی لەگۆشەیەکدا دەڵێ ئەم وشەیە لەو وشەیە دەچێت، ئەم ڕستەیە لە ڕستەیەکی ئاڤێستا، یان تەورات دەچێت، کەواتە لەوان وەرگیراوە، تا کۆتایی لاپەڕە (49) لەسەر ئەم تەرزە دەڕوات، بۆیە بە پێویستی نازانم وەڵامی هەموو نموونەکانی بدەمەوە. لەڕایەکی پێشتر نەوتراودا نووسەر دەڵێت: "کە هاوەڵەکانی موحەممەد سەرچاوەیەکی تری داڕشتنی قورئان بوون". لە لاپەڕە (44)ەوە هەتا (55)، لەژێر سەرباسی (داڕشتنی ئایەت بەدوای ڕوداودا، ڕۆڵی کەسانی نزیکی موحەممەد لە داڕشتنی ئایەتەکاندا، کۆکردنەوەی قورئان، ڕێکخستنی قورئان، ڕێکخستنی ئایەت و سوورەتەکان)، کۆمەڵی مەسەلەی باسکردووە، هەڵەو دژەوانەی زۆری تێدایە، سەرجەم وەڵامێکی ئەو گومانانە دەنووسم بە پشت بەستن بەهەمان سەرچاوەی خۆی (مباحث في علوم القرآن)، بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێ، ئەم نووسەرە چەندە خیانەتی بەرامبەر بەو نووسەرەش کردووە.

## هۆکاری دابەزینی قورئان ( أسباب النزول )

ئەگەر بەڕێژە وەریبگرین، دەتوانین بڵێین بەڕێژەی 8٪ی سورەت و ئایەتەکانی قورئان بەهۆی ڕووداوێك یان هەڵوێستێکەوە دابەزیون، واتە ڕووداوێك ڕوویداوە لە دوورگەی عەرەبیی، یان دەورووبەریدا، یان ناوچەکەدا، پێویستی بە وەرگرتنی هەڵوێست بووە (بەپێی مەشیئەتی خوداوەند)، خوای گەورە ئایەتی دابەزاندووە بۆ سەر دڵی پێغەمبەر (ﷺ)و تەواوی مەسەلەکەی بۆ ڕوونکردووەتەوە. وەك ڕووداوی شەڕی بەدرو ئوحودو فەتحی مەککەو...هتد. زانایان ئەو بەشەی ئایەتەکانی قورئانیان ناوناوە (أسباب النزول)، واتە: هۆی دابەزینی ئایەتەکان. هەندێجار ئەو هۆیە، پرسیاری کەسێك بووە، وەك پرسیاری مانگ و حەیزو چارەنووسی کێوەکان، خودای مەزن لەوەڵامیاندا چەندین ئایەتی دابەزاندووە وەك ئایەتی: (ویسألونك عن الجبال) سورەتی (طه)، هەروەها ئایەتی (ویسألونك عن الاهله) سورەتی (البقرة) هەروەها ئایەتی (ویسألونك عن المحیض) سورەتی (البقرة)، یان هەندێجار کێشەیەك ڕویداوەو قورئان دابەزیوە بۆ چارەسەرکردنی، وەك سورەتی (المجادلة، 1) (قد سمع الله قول التي تجادلك في زوجها) کە لەبارەی ئەوسی کوڕی صامت و خێزانەکەیەوە دابەزی کەناوی خەولەی کچی سەعلەبەیە، هەندێجار موشریکێك هەڵوێستێکی زۆر ناقۆڵاو ناشیرین دەنوێنێ، قورئان وەڵامی دەداتەوە، وەك سورەتی (لهب) کەلە بارەی (ئەبولەهەب)ی مامی پێغەمبەر (ﷺ)و هاوسەرەکەیەوە دابەزی، کە بەتوندی دژایەتی پێغەمبەریان دەکرد. ئەمانەو چەندین حاڵەتیتر، مەسەلەکەش پەیوەست نییە بەهۆی دابەزینی ئایەتەکەوە، بەڵکو بۆ زانینی فەلسەفەو حیکمەتی ئایەتەکانە، هەروەها ئایەتەکانی (إفك) کە لە سورەتی (النور)دا دابەزین بۆ ئیسپاتککردنی پاکزادەیی خاتوو عائیشە، لە ئایەتەکانی (أسباب نزول)وە زانایانی (اصول) ڕێسایەکی یاسایی بنەڕەتیان داڕشتووە بۆ تێگەیشتن لە قورئان کە دەڵێ: (العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب)، واتە گرنگ مانای گشتیی دەقەکەیە، نەك تایبەتمەندیی هۆی دابەزینەکەی. ئەم ڕێسایە تا ئەم ساتەوەختە بۆ خوێندنەوەی دەقی یاسایی و دەستووریی جۆراوجۆر بەکاردەهێنرێت. لە (سبب نزول)دا نووسەر کەوتۆتە هەڵەی ئەوەوە گوایە هۆکاری دابەزینەکان پەیوەندیی بەکەسەکانەوەیەو ئەوان بەشداریان کردووە لە داڕشتنی دەقەکاندا، ئەمە حاڵی نەبوونە لە (أسباب النزول)و فەلسەفەی دابەزینی ئایەتەکان، هاوکات (پێویست) بۆ ڕێژەی (92٪)ی ئەو ئایەتانەی قورئان چی دەڵێت کە پەیوەندیان بە هیچ ڕووداوو کەس و لایەن و جوگرافیاو مێژووەیەکەوە نییە؟ لەگریمانەیەکی مەحاڵدا، ئەگەر قسەکەی (پێویست) بۆ (8٪)ی قورئان ڕاست بێت، کەوا نییە. ئەوا بێگومان هەموو قسەکانی بۆ (92٪)ی ئایەتەکانی قورئان بەدرۆدەکەوێتەوەو لێکهەڵدەوەشێ.

سەبارەت بە کۆکردنەوەی قورئانیش، مانای پاراستنیەتی لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)، چونکە پێغەمبەری خودا (ﷺ) شەیدای دابەزینی ئایەتەکان بوو، لەبەری دەکردن و لێیان تێدەگەیشت، ئەوەش بە فەرمانی خودا بوو (إن علینا جمعه وقرآنه) سورەتی (القیامة 16–19) واتە: ئەرکی ئێمە کۆکردنەوەو پاراستنی قورئانە. پێشەوا بوخاری لە

صەحیحەکەی خۆیدا بە سێ گێڕانەوە ناوی حەوت حافز قورئانی نووسیوە، کە بریتین لە: عەبدوڵڵا کوڕی مەسعود، سالم کوڕی موعقل، موعاز کوڕی جەبەل، ئەبی کوڕی کەعب، زەید کوڕی سابت، ئەبو زەید کوڕی ئەلسەکن، ئەبو دەرداء) هەرچەندە بوونی ئەم حەوت کەسە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە حافزی تر نەبوون، بەڵکو چەندین هاوەڵان و شوێنکەوتووی تر هەبوون کێبڕکێیان دەکرد بۆ لەبەرکردنی قورئان، بۆ نموونە (ئەبو عەبید خوزاعی) فەرمووەدەناسی گەورە ناوی چەند حافزێکی تری نووسیوە لەوانە: (چوار یارەکەی پێغەمبەر (ﷺ)، تەلحە، سەعد، ئیبن مەسعود، حوزەیفە، سالم، ئەبو هورەیرە، ئیبن ئەلسائب، عەبادیلە (کە هەر چوار عەبدوڵڵا ناوەکانن: عەبدوڵڵا کوڕی عەباس، عەبدوڵڵا کوڕی عومەر، عەبدوڵڵا کوڕی عەمر کوڕی عاص، عەبدوڵڵا کوڕی زوبێر)، پێغەمبەری خودا (ﷺ) چەند کەسێکی لەبەردەستدا بوو کاریان نووسینەوەی وەحی بوو، وەك (عەلی، موعاویە، ئەبی کوڕی کەعب، زەید)، ئەمانە لەسەر چەرم و پێستی وشکەوەبوو، قوڕ، قەدی دارخورماو تەنکەبەردو شتی تر، دەقەکانی قورئانیان دەنووسیوە، لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) وەفاتی کرد، هەموو قورئان، لە سنگ و لەسەر ئەو شتانەی لە پێشەوە باسکران کۆکرابووەوە، بەڵام بە پارچە پارچەیی، ئەوانەی بەم کارەهەستان نووسەران و حافزەکانی وەحی بوون، زانایان دەڵێن: کە (زەید کوڕی سابت) پێش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) قورئانی بە کۆکراوەیی نیشانی هەمووان داوە، ئەم کۆکردنەوەیەی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) بە حیفز، یان کۆکردنەوەی یەکەم ناوزەدکراوە.

لەسەردەمی ئەبوبەکری سدیقدا (خوا لێی ڕازی بێت) کاتێ کە زیاتر لە (70) هاوڕێی قورئانخوێنی هاوەڵی شەهیدبوون، عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی ڕازی بێت) ئاماژەی کرد بۆ ئەبوبەکرو پێشنیازی کۆکردنەوەی موسحەفەکانی بۆ کرد. بەفەرمانی ئەبوبەکر، زەیدی کوڕی حارسە هەستا بەکۆکردنەوەی هەموو قورئان لە (سنگ)و هەموو ئەو پارچانەی لەسەری نووسرابوون، کردی بەیەك موسحەف و لای ئەو مایەوە، شێوازەکەشی لەسەر زاری حەوت پیتەکان بووە، بۆیە دەتوانین بڵێین ئەبوبەکر یەکەم کەسە قورئانی کۆکردبێتەوە، لەم بارەیەوە عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: "زۆرترین پاداشت لەبارەی کۆکردنەوەی موسحەفەوە بۆ ئەبوبەکرە، ڕەحمەتی خودا لەسەر ئەبوبەکر، چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کە فەرمانیدا بە کۆکردنەوەی قورئان". کەواتە دوای پێغەمبەر (ﷺ) جارێکی تریش بەیەك موسحەف لەسەردەمی ئەبوبەکردا کۆکرایەوە، بەڵام چەندین نووسراوی موسحەف لای هاوەڵانی تریش هەبوون، وەك (عەلی و ئوبەی و ئیبن مەسعود)،، بەڵام بەمشێوە وردەکارییەی ئەبوبەکر، نەبوو.

لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففانیشدا (خوا لێێ ڕازی بێت)، کە فتووحاتی ئیسلامیی بەرفراوان بووبوو، هاوەڵانی حافزیش بڵاوەیان کردبوو بە ناوچەو شوێنە جیاجیاکاندا، هەریەکەو بە پێی خوێندنەوەیەك قورئانی بۆ خەڵك دەخوێندەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی، یەکەم کە قورئانیان دەناسی کێشە نەبوو، بەڵام عوسمان (خوا لێی ڕازی بێت) ترسی ئەوەی لێنیشتبوو کە نەوەکانی دوای ئەوان بەو ئاستە بەرزەی زمانپاراویی و لێزانیە نەبن، بۆیە پێشنیازی کرد بۆ گەورەهاوەڵان کە لیژنەیەك دروست بکەن بە چەسپاندنی شێوازی موسحەفەکەی ئەبوبەکرو هەموو خوێندنەوەکان لەسەر ئەوە ڕێکبخات کە بەپێی موسحەفەکەی ئەبوبەکرە (خوا لێی ڕازی بێت)، عوسمان ناردی بەدوای حەفصەی هاوسەری پێغەمبەردا (ﷺ)و کچی عومەری کوڕی خەتتاب، (ڕەزای خوای لێبێت) کە موسحەفەکەی بۆ بهێنێ، ئەوجا ناردی بەدوای (زەیدی کوڕی سابت ئەنصاری)، (عەبدوڵڵا کوڕی زوبێر)، (سەعدی کوڕی عاص)، (عەبدوڕڕەحمان کوڕی حارس)و فەرمانی پێدان کە لە موسحەفدا کۆی بکەنەوە، فەرمانیشی پێدان کە لەبوونی هەر ڕاجیاوازییەکدا بە زمانی قوڕەیش بینووسنەوە، چونکە قورئان بە فۆنەتیکی ئەوان دابەزیوە، ئەوەبوو بەپێی ئەو فەرمانە دەستکرا بەکۆکردنەوەی موسحەف، هەموو شوێنەکانی تر لە چەند موسحەفێکی دیاریکراودا کۆکرانەوەو درانەوە دەست حەفسە، ئەوجا لەو موسحەفە، کە لای حەفسەیە چەندین نوسخەیان نووسیەوەو بەهەموو لایەکی وڵاتدا بڵاویان کردەوە، پاشان فەرمانیدا بە سووتاندنی هەموو (موسحەف)ەکانی تر کە لەسەر ئەوە نەنووسرابوونەوە، زەید کە یەکێکە لەکۆکەرەوەکانی قورئان و بەدەستی خۆی نووسیویەتی، دەڵێ "هەموو جاری گوێم لێ دەبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) سورەتی ئەحزابی دەخوێندەوە ئەم ئایەتەی دەخوێند (من المؤمنین رجال صدقوا ماعاهدوا الله علیه) سورەتی (الاحزاب) ئایەتی (23)، دەڵێ گەڕام لای (خزیمة بن

ثابت)ی ئەنساری دۆزیمەوەو خستمانەوە سەر سورەتی (الاحزاب) وەك چۆن لە پێغەمبەرم بیستبوو، هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) یەکدەنگبوون لەسەر ئەمکارەو لەیەك پیت لەو حەوت پیتەی قورئانی پێدابەزیوە نووسرایەوە".

بۆ ئەوەی خەڵك لەسەری کۆدەنگبن، موسحەفەکەی بڵاوکردەوە بەهەموو ناوچە جیاجیاکاندا، موسحەفە بنەڕەتیەکەشی لای خۆی هێشتەوە لەمەدینە کە ناوی (مصحف الامام) بوو.

ئەمە بەسەرهاتی کۆکردنەوەی قورئانە، ئەویش کە (پێویست) لەو کتێبەیدا باسی دەکات، جگە لە تێکەڵو پێکەڵکردنی زانیارییەکانو دڵەڕاوکێو گومان، چی دیکە نییە، بەدەر لەمانە ئەوەی (پێویست) دەیڵێت گوتەی توندڕەوەکانی (شیعە)و لادەرانو بێباوەڕانەو پەیوەندی نییە بەم پرۆسەیەوە.

سەبارەت بە ڕێکخستنی سوورەتەکان، (پێویست) لەبەرگی ڕەخنەگرێکی بەویقارو عەقڵ گەورەدا، ڕستەیەك دەڵێ: "ئەگەر کەسێك بەوردیو بەچاوی ڕەخنەوە، قورئان لەبەرگەوە بۆ بەرگ بخوێنێتەوە هەست بەلاوازییو ناڕێکی دەکات لە شێوازی ڕێکخستنو ڕیزبەندی سورەتو ئایەتەکاندا) (ل52 ئایا قورئان...). پاشان جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیانی خۆیدا دەربەست نەبووە بۆ کۆکردنەوەو ڕێکخستنی سورەتو ئایەتەکان بەو شێوەیەی ئێستا هەیە، باس لە قورئانێکی عەلی دەکات، کە تەرتیبەکەی جیاوازە لەوەی هەیە!!، ئەم حیکایەتو قسەوباسانە، بنەڕەتو سەرچاوەیەکی ڕاستیان نییە، مەسەلەی ڕێکخستنی سورەتو ئایەتەکان لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) کراوە، ئەو جیاوازیە کە لە نێوان هاوەڵاندا هەبوو لەسەر پێشو پاشی سوورەتو ئایەتەکان، پەیوەستە بەسەردەمی کۆکردنەوەی موسحەفی لای هاوەڵان، لەکاتێکدا چەندین فەرمووده هەن کە جەخت لەسەر ئەو تەرتیبەی ئێستا دەکەنەوە کە جبریل (علیه السلام)، چەندین جار بەم شێوازانە بۆ پێغەمبەری خودای خوێندووەتەوە، پاشان ئەو ڕێکخستنە چ لاوازییەکی تێدایە؟ قورئان کتێبی کراوەی گەردوونە، مرۆڤ لەهەرجێگەو قۆناغێکدا سەیری بکات هەست بەگەورەییو جوانیو بابەتییەتی قورئان دەکات، نەك (لاوازییو ناڕێکی)یەکەی (پێویست)!!. لەبنەڕەتیشدا مامەڵەکردن لەگەڵ قورئاندا بەپێی ڕێکخستنی سوورەت، یان ئایەت نییە، بەڵکو بەپێی بابەتو قۆناغی دابەزینی ئەو ئایاتەیە، یان سوورەتەیە کە چەندین بابەتی جۆراوجۆر چارەسەردەکات، ئەوە چوارده سەدەیە مرۆڤەکان قورئان دەخوێننەوە، بەم چاوەی (پێویست) سەیری قورئان ناکەن، بەڵام (پێویست) ڕاست دەکات بەرگی دەرەوەی هەردوو دیوی قورئانی خوێندووەتەوەو دیارە پێدەچێت ڕەنگی بەرگەکەی بەدڵ نەبووبێت!!، ئەگەرنا ئەوەی سەیری نووسینەکەی (پێویست) دەکات، بەتایبەتی لەدوای ئەم بەشەوە تێدەگات کە (پێویست) چاوی بە قورئان نەکەوتووە!.

## گفتوگۆ لەسەر بەشی سێیەمی باسەکە

نووسەر لەم بەشەدا پێما ن دەڵێ کە: ڕەنگدانەوەی تەرازووی هێزەکان قورئانی خوڵقاندووە بەو شێوازەی کە باس لە ڕووداوەکان دەکات، ئەم باسەش دەکات بە دوو بەشی سەرەکییەوە، قۆناغی پێش کۆچو قۆناغی پاش کۆچ.

(پێویست) دەڵێ: "موحەممەد... وەك کەسێکی مرۆڤدۆستو چاکسازی کۆمەڵایەتیی، بانگەوازی خەڵکی دەکرد بۆ ئاشتی، یەکێتی، برایەتی، ڕەفتارباشیی، چاککردنو دوورکەوتنەوە لەکرداری خراپە" (ل59 ئایا قورئان...)

پاشان چەند نموونەیەك لەسەر ئارامیو دانبەخۆداگرتنی دەهێنێتەوە لەبەردەم قوڕەیشییەکاندا، ئاماژە بۆ چەند ئایەتێك دەکات کەلەسەر هەندێ موشریکی بەدکردار، دهاتنەخوارەوە. (نووسەر) پوختەی قسەکانی لەوەدا کۆدەکاتەوە، لەبەرئەوەی مسوڵمانەکان کەمدەستو بێهێزبوونو تەرازووی هێز بەلای قوڕەیشدا بوو، موحەممەد هانی دەدان بۆ ئارامیو دانبەخۆداگرتن، ئەگەر ئەم قسەیە لە سیاقی مێژوویی خۆی بهێنینە دەرەوە چ لەکەیەکی تێدایە!؟ زیاد لەوەش ئەمە بەڵگەیە لەسەر قوڵی عەقڵی سیاسییو دەعەوی موحەممەد، هەرچەندە ڕاستییەکەی ئەوەیە کەدەبوایە کۆمەڵێ مرۆڤ بەکادرو بەتوانا پەروەردەبن بۆ هەڵگرتنی ئەو پەیامە مەزنە، چونکە دەوڵەتی مەدینە لەسەر شانی ئەو کۆمەڵە گەنجەو گەنجەکانی مەدینەو دروستبوو، ئەوانە گەنجی میحنەت بوون، قاڵبوون لە ئازارو چەرمەسەرێتی ژیان، ناوەرۆکی گوتاری پێش هیجرەت پەیوەندی بەلاوازی بەرەی مسوڵمانەکانەوە نییە، هەرچەندە ئەوە لەڕووی سیاسییەوە لەکەیەکی تێدایە

نییە، بەڵکو پەیوەستە بەداخوازی بابەتیی و خودی مسوڵمانەکانەوە کە پێویستە بزانن دەبێ هەڵگری بانگەواز ئەو بەرنامە فیکریی و سیاسیی و دەعەویی و رۆشنبیریی و پەروەردەییە بزانێ کە خراوەتە سەرشانی ئەوان، بەدەمەوە هاتنی قورئان و پاڵپشتیکردنیان، ئەو مانایە نادات بەدەستەوە کە ڕووداوەکان داڕێژەری ئایەتەکان بن، هەرچی ڕووداوەکانە باس لە ڕەگەزەکانی (کات و شوێن و ڕوداوەکان) دەکەن، بەڵام قورئان باس لە هیچ یەکێ لەو ڕووداوانە ناکات، بەڵکو لە گۆشەنیگای هەڵسەنگاندن و خوێندنەوەی پەروەردەیی و دەعەویەوە سەیری ڕووداوەکان دەکات، زۆر جاریش ڕەخنە لە هەڵوێستی خودی پێغەمبەر (ﷺ) و مسوڵمانەکان دەگیرێت، کە نەدەبوایە ئەو کارە بکەن، لەڕووداوەکان و سیاقی ئایەتەکاندا هیچ جۆرە بەڵگەو ئاماژەیەك نییە بۆ قسەکانی نووسەر، مامەڵەکردنی دەقەکانی قورئان لەگەڵ ڕووداوەکاندا حاڵەتێکی سروشتییە، چونکە خودی وەحی بۆ گۆڕینی ژیانی کۆمەڵگا هاتووە، پێشتریش لەسەردەمی پێغەمبەرانیتردا (علیهم السلام) وەحی هەمان پەیامی پێبوو.

لەم بەشەدا پەرەگرافێك سەرنجی منی ڕاکێشا، کە دەقاودەق بەشێکە لە کتێبی (حسين مروة)و (پێویست) لەم کتێبەدا وەریگرتووەو دەڵێت: "ئیسلام لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی قورەیشدا ناکۆك نەبوو!!، ئیدی بۆ بەرەنگاری وەستانەوەو ئەو هەموو شەڕەیان لەگەڵدا بەرپاکردو تا دواین قۆناغی دەسەڵاتی خۆیان ململانێیان لەگەڵدا کرد؟" ئەم قسەیە بۆ (حسين مروة) چەواشەکردنی خوێنەرە بەرامبەر وەحی و هەڵوێستەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵام بۆ (پێویست) ئەوپەڕی بێئاگایی دەگەیەنێت، چونکە ڕستەکەی (مروة)ی لە شوێنێکدا داناوە پەیوەندی بە باسەکەی (پێویست)ەوە نییەو (حسين مروة) لە سیاقێکی تردا ئەو پەرەگرافەی وتووە.

لە قۆناغی پاش کۆچدا، نووسەر دەڵێت: "هەرچی جولەکەکانیش بوو –مەبەستی جولەکەی مەدینەیە– لە ململانێی نێوان موحەممەدو قورەیشییەکاندا سەرکەوتنی موحەممەدیان لا باشتربوو، چونکە ئەمانیش باوەڕیان بە یەکخواناسیی هەبوو، لەگەڵ بتپەرستیی قورەیشییەکاندا نەبوون..." (ل65 ئایا قورئان....)

ئەم قسەیەی (پێویست) جگە لەوەی قسەی گێرفانەو پەیوەندی بە سادەترین زانیاری دەربارەی جولەکەی مەدینەوە نییە، کۆمەڵێ هەڵەی زەقیشی تێدایە، لەوانە:

جولەکەی مەدینە بە هەموو مەودای ژیانیان، لە هیچ بڕگەیەکی مێژوویدا سەرکەوتنی پێغەمبەریان پێخۆش نەبووە لەگەڵ قورەیشییەکاندا، زیاد لەوەش لەگەڵ سەرانی قورەیشدا هاوپەیمان بوون بۆ لێدانی پێغەمبەرو پەیامەکەی، هەردەم خەریکی پیلان و نەخشەی لەناوبردنی دەوڵەتی مەدینە بوون، هاوکات جولەکە یەکخوداپەرستیش نەبوون، پێیانوابوو عەرەبی دوورگە لەسەر بتپەرستی بن باشترە لەوەی شوێن موحەممەد (ﷺ) بکەون، بۆیە مسوڵمانەکان لە پاش کۆچکردن لەگەڵ جولەکەدا هەموو مەسەلەکانیان یەکلاکردەوە، لە سیاقەکانی ئەم بەشەدا نووسەر جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە گوتاری ئیسلام لە قۆناغی مەدینەدا، لە ئاشتییەوە گۆڕاوە بۆ گوتاری شەڕو جیهادو کوشتارو تیرۆرکردنی نەیارەکان، لە تەفسیرێکی سەمەرەدا نووسەر دەڵێ ئایەتی (من يطع الرسول فقد أطاع الله) (النساء 80)، مانای ئەوە دەگەیەنێ "هەر کەسێك پەیڕەوی پێغەمبەری ئیسلام نەکات مانای پەیڕەوی خودای نەکردووە، هەرکەسێکیش پەیڕەوی خودا نەکات یانی بەکافر دەدرێتە قەڵەم، کافریش دژی ئیسلامەو تاوانبارە" (ل73، ئایا قورئان...) ئایا دەکرێ بپرسین کاکی نووسەر ئەم تەفسیرە عەنتیکەیەی لەکوێوە هێناوە؟، ئایا ئەم شیتەڵکردنەی نووسەر، بە تەواوی بێئاگایی نووسەر ناگەیەنێت؟!.

نووسەر لەم بەشانەدا لە چەند شوێنێکدا بە زمانی حاڵی خۆی دەڵێت: ئەم ئایەتە دابەزی بۆ موحەممەد، (ﷺ) بۆ نموونە "بۆیە ئەم ئایەتە دابەزی ..." (ل72 ئایا قورئان...)، هەروەها "ئەم ئایەتە بۆ گۆڕینی قیبلە دابەزی...ل74" هەروەها "ئەم ئایەتەی خوارەوە دابەزی کە ئاگادارکردنەوەی هەڕەشە بوو بۆ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی....ل74" هاوکات لەچەندین شوێندا نووسەر شایەتومان بە شانی موحەممەدیشدا دەهێنێت و دەڵێ "پێغەمبەری ئیسلام بۆ هاندان و بەرزکردنەوەی ....ل76) هەروەها "موحەممەد پێغەمبەری ئیسلام خۆشی لەم شەڕەدا بریندار کرا...ل77) هەروەها "بەڵام موحەممەد پێغەمبەری ئیسلام بەگوێرەی ئەم ئایاتانەی خوارەوە ...ل77".

خوێنەری بەڕێز هەتا ئەم ساتەوەختە ئێمە لەگەڵ نووسەرێکی بێباوەڕو بێعەقیدەدا مامەڵەمان دەکرد، کەچی ئێستا باوەڕی وایە وەحی دابەزیوەو موحەممەدیش پێغەمبەری ئیسلامە!! ئەدی براو خوشکی مسوڵمان چیتان دەوێ؟.

وەڵام: بە شایەتومانێکی هەق پێموایە کە گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەم نووسەرەدا تا کۆتایی باسەکانی بە وردو درشتەوە مانایەکی نییە، بەڵام چەند بڕگەیەکی بەرچاو لە باسەکانی هەڵدەبژێرم، چونکە نووسەر لەم بەشەدا بە تەواوی دژەوانەی سەرباسی کتێبەکەی خۆیەتی کە دەڵێ قورئان ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆیەتی، هەرخۆی پێمان دەڵێ: نەخێر قورئان ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی نییەو وەحیەو لە ئاسمانەوە دابەزیوە، موحەممەدیش بەڕاستی پێغەمبەری خودایە.

لە بەشی چوارەمیشدا نووسەر واز لەوەدەهێنێت کە قورئان وەحی نییە، ئەڕواتە سەر مەنهەجی پەروەردەیی لە قورئانداو ڕەخنەگرتن لە شێوازی ترساندن(ترهیب)، کە گوایە مەنهەجی قورئانی‌و پاشانیش هەڵسەنگاندنی باسی مزگێنی‌و پاداشت، حیکایەت‌و قسەی عەنتیکەی وەها دێنی کە زیاتر لە قسەی نوکتەو تەنز دەچن‌و حورمەتی ئەوەیان نییە گفتوگۆیان لەسەر بکرێت، هاوکات لەم باسەدا بە تەواویی لەسەر باسی مەنهەجی لێکۆڵینەوەکەی دوورکەوتووەتەوەو کەوتووەتە باسی ڕووداوەکانی سیرە و مێژوو هەڵسەنگاندنی ئەو ڕووداوانە بەپێی میزاج‌و سەلیقەی خۆی، بەبێ گوێدانە کرۆک‌و هۆی ڕاستەقینەی مەسەلەکان. لەبەرئەوەی من بۆ خۆم ئەو بەشەم هەڵبژاردووە لە کتێبەکەدا کە باس لەوەدەکات قورئان کتێبی ئاسمان نییەو دانراوی خودی پێغەمبەرو هاوەڵەکانییەتی، ئیدی لێرەوە کات ناکوژم بەدیار ئەم باسە مێژووییانەوە، چونکە لە باس‌و لێکۆڵینەوەکانی تری پڕۆژەی (تیشك)دا، قسەیان لەسەرکردوەو دووبارەو سێبارە بوونەتەوە.

لە هەوڵێکی نائومێدو پڕ بە باڵای پەرەگرافێکی تووڕە، نووسەر دەڵێ: "لەڕاستیدا هیچ ئایینێك لە غەیبەوە نەهاتووە، ئایینی ئیسلام‌و بەرنامەی قورئان وە هەموو ئەو ڕیفۆرم‌و ئاڵوگۆڕانەی کە خوازیاری بووە، لە سوورەت‌و ئایەتەکاندا داڕێژراوە، لە پەیوەندی بە هەلومەرجی تایبەتی سەردەمێکی دیاریکراوی گەشەی هۆشیاری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای عەرەبستان‌و ناکۆکیە کۆمەڵایەتییەکانیدا هاتۆتە ئاراوە." (ل104 ئایا قورئان...) هەموو هەوڵەکانی نووسەر تا بەشی پێنجەمی کتێبەکەی بۆ سەلماندنی ئەم پەرەگرافە بووە، کەچی ئەوەشی بۆ نەسەلماوە. بۆیە تۆمەتی ئەفسانەو شتی پڕوپوچ‌و وەهم دەداتە پاڵ ئایینپەروەران، دەکرێ نووسەر لە دەرەوەی مەنتیقی قسەکانی خۆی‌و ئەو لاپەڕە هەژارانەی کە نووسیویەتی سەیری واقیعی ژیانی ئەمڕۆ بکات‌و ببینێ کە ژمارەی مسوڵمانەکانی دنیا چەندن‌و لایەکیش بکاتەوە بەلای ئەو بێباوەڕە کوێرو دڵ پڕ لە بوغزو کینانەداو سەیری قەوارەو کێشیان بکات، ئەوجا دەتوانێ لە ڕووبینای ڕاستییەوە بە چاوی عەقڵ خۆی هەڵسەنگێنێت‌و بزانێت بەکێ دەڵێت ئەفسانەچی‌و خورافەچی‌و وەهم پەرست؟!. چیرۆکەکانی قورئان وەهم‌و ئەفسانە نین، بەسەرهاتی مێژوویی ڕاستەقینەن‌و لە زەمەن‌و قۆناغە مێژووییە کۆنەکاندا پرسیارو قسەیان لەسەرکراوە، یەکێك بوو لە پرسیارەکانی ئەوکاتەی عەرەب، ئەم بەسەرهاتانە لە قۆناغەکانی پێش ئیسلامدا ڕوویانداوەو هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی ئەو بەسەرهاتە بەدرۆ ناخاتەوە، کێشەی نووسەر لەوەدایە کە ئەو بەسەرهاتە لە قورئاندا باسی لێوەکراوە، لێرەوە بەسەرهاتەکە لەڕووداوێکی مێژوویی گرنگەوە دەبێتە (ئەفسانە) لای نووسەر، ئەمە یەکێکە لە کێشە سەرەکییەکانی (پێویست)و بەبێ بەڵگەش ئەو تۆمەتە دەخاتە پاڵ ڕووداوو بەسەرهاتەکانی قورئان.

لەسەر هەمان پێڕەوی هەڵە قسە لەسەر ڕووداوەکانی (شەوڕەویی‌و بڵندبوونەوە)و بەسەرهاتی موساو عیساو مەریەم‌و سلێمان (علیهم السلام) دەکات، کە لە کتێبە ئاسمانییەکانی تریشدا –پێش دەستتێوەردانیان- باسیان لێوەکراوەو هەتا ئەوڕۆکەش شوێنکەوتوانی ئەو ئایینانە باس لەو ڕووداوانە دەکەن.

لەسەر باسێکی سەیرو چاوەڕوان نەکراودا، نووسەر باز دەدات بەسەر هەموو باسەکانی خۆیداو باسی (تیرۆر) دەهێنێتە ناو باسەکانیەوە.

لە لاپەڕە (112)دا دەڵێت: "لە قورئاندا حەوت جار بەشێوەی جۆراوجۆر، وشەی تیرۆر (ئیرهاب) لە سورەتەکانی (البقرة -40)و (الاعراف- 154)و (الانفال-60)و (النحل-51)و (الانبیاء-90)و (القیامة-32)و (الحشر-13) هەندێ لەو ئایەتە قورئانیانە بۆ نموونە دەهێنێتەوە، لە مانای ئەو ئایەتەدا نووسەر بێگوێدانە ڕەوشتی نووسین دەڵێت:

"ئەگەرچی وەك وشە تیرۆر لە قورئاندا بەکارنەهاتووە، بەڵام بەماناو ناوەرۆك هەر بانگەوازی تیرۆر دەکات، داوا لەمسوڵمانان دەکات دژی نەیارانی پیادەی بکەن" (ل113 ئایا قورئان..). ئەم لێکدانەوەی (نووسەر) وەك دەستخوێندنەوەی فاڵچییەکان وەهایە، پشت بە خەملاندنو لێکدانەوەیەکی زاتیی دوور لە مەنهەجو بابەت دەبەستێ و ناکرێ وەك قسەیەکی هاوسەنگ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. ئەو ئایەتانە باس لەحاڵەتێکی دەروونیی سیاسیی دەکەنو هیچ پەیوەندییان بەمەسەلەی ئیرهابو تیرۆرەوە نییە، کە نووسەر خۆی پێوە سەغڵەت کردووە، کەمەندکێشکردنی ئەو ئایەتە بۆ سەردەمی (11)ی سێبتەمبەرو لێکدانەوەی لەژێر ڕۆشنایی ئەوەدا، بێ ماناییەو ستەمێکی گەورەیە لە قورئان.

کە سەیری سەرچاوەکانی بەشی چوارەمو پێنجەم دەکەیتەوە، هەمان سەرچاوەکانی بەشەکانی ترەو پەیوەندییان نییە بە قورئانو فەرموودەو مێژوو سیرەی کەسێتییەکانی ئیسلامەوە.

نووسەر بەشێکی تری باسەکانی تەرخان دەکات بۆ باسی ژن لە قورئانداو لە باسی سەرەکی خۆی دەردەچێت و دەکەوێتە سەر هێڵی بەکەمزانینی ژن لە گوتاری قورئانییدا، بەو پێیەی کە بنەڕەتی وەڵامەکەی من پەیوەست نییە بەو شیتەڵکارییەوە، خودی نووسەریش لەو باسە بۆتەوە کە مەسەلەی وەحیەو کەوتووەتە شیکردنەوەی دەقەکانو ساغکردنەوەی ئایدۆلۆژیای دژەئایینو بێنرخکردنی گوتارەکانی قورئان، ئەم باسە جێدێڵم بۆ باسێکی تری پرۆژەی (تیشك).

## کۆتا بەش

لە کۆتابەشی کتێبەکە، (پێویست) باری سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشێت بۆ هەندێ خاڵ، وەك خۆی دەڵێت: "جێگەی سەرنجن" (ل149 ئایا قورئان...).

### 1. چەندبارەبوونەوە:

نووسەر لە پێناسەی دەقی سەرکەوتوودا ئامۆژگاریمان دەکاتو دەڵێ: "یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی دەقی سەکەوتوو ئەوەیە کە لەچەند بارەکردنەوەی ڕستەو بڕگە بەهەمان مەبەستو ماناوە خۆی بپارێزێت، بەڵام لەداڕشتنی قورئاندا ئەم لایەنە ڕەچاو نەکراوە" (ل150 ئایا قورئان...). نازانم، نووسەر باس لەدەقی شیعر دەکات، یان پەخشانە شیعر، یان سەروادار، یان شیعری کلاسیك، یان وتار .. یان چیو چی؟ بە پێچەوانەوە جگە لە دەقی دەستووری یاسا، لەهەموو بوارەکانی دیراسەی مانای (دەق)دا دووبارەبوونەوە مانایەکی ئیجابیی هەیە، هەرچەندە قورئان نە کتێبی دەستوورەو نە یاساو نە ئەدەب، ئەو پەیامی خودایە بۆ هۆشیارکردنەوەی مرۆڤ، دووبارەبوونەوەی ڕستەو مانا بەشێکی گرنگە لە مەنهەجی تەڵقینو پەروەردەکردن، کە کاکی نووسەر بە خاڵی لاوازی دەزانێت، (جنات تجری من تحتها الانهار) کە نووسەر دەڵێ (41) جار لە قورئاندا دووبارە بووەتەوە، باسکردنە لە جوانی بەهەشت، یەکێك لە جوانییەکانی بەهەشت (جنات)ە کە بە ژێریدا ئاوی سازگار دەڕوات، چەندبارە نیشاندانی ئەم چەشمەندازە، نەك خاڵی لاواز، بگرە خاڵی بەهێزو کاریگەری قورئانە.

### 2. موبالەغە:

نووسەر لە شەرحی موبالەغەدا دەڵێ: "موبالەغە بریتییە لە باسکردنی ڕووداوێکی جیاواز لەوەی کە لەواقیعدا ڕوویداوە" (ل125 ئایا قورئان ...)، خوێنەری بەڕێز ویژدانی خۆت بکە بەناوبژیوان، ئەمە پێناسەی سیحرە، یان موبالەغە؟! بۆ نموونە کەسێك بەڕێزە لە موبالەغەدا، دەڵێن زۆر زۆر بەڕێزە، هەر لێرەوە کاکی نووسەر نموونەکانیشی بەهەڵە هێناوەتەوە.

### 3. تواناو دەسەلاتی خودا:

نووسەر بەزۆری دەزانێ کە بەو ئەندازەیە موحەممەد (ﷺ) باس لە گەورەیی دەسەلاتی خودا دەکاتو پێیوایە کە ئەوە لە بارێکەوە وەلامی سەرسامییەکانی خۆیەتی، لەلایەکی دیکەشەوە پەی نەبردووە بە زانست و ڕادەی پێشکەوتنی مرۆڤ.

بۆیە لەهەموو ئەوانە پەنا دەباتەوە بۆ خوداوەند، باسکردنی دەسەڵاتی خواوەند بەشی هەرە گرنگ و کاریگەریی هەیە لە پەیامە ئاسمانییەکاندا، بە تایبەتی قورئان. مەگەر چۆن دەبێ مرۆڤ پەیامێك لەخودایەکەوە وەربگرێت کەنایناسێت، حاڵەتێکی سرووشتییە کەخودا لە پەڕاوەکەی خۆیدا خۆی بناسێنێت بۆ بەندەکانی خۆی، هەوکات ئەم خۆناساندنە مانای تۆقاندنو سفرکردنی مرۆڤ ناگەیەنێت، چونکە مرۆڤ لە قورئاندا بوونەوەری یەکەمە کە قورئان گرنگیی بە باسەکانی دەدات، ئەگەر بەگوێرەی قسەکانی (پێویست) بێت، مرۆڤایەتی بۆ (15) سەدەیە بە فەیلەسوف و عارف و خوێندەوارو زانا و ڕۆشنبیرەوە لە حاڵەتی تۆقاندنو سەرسامیدا دەژینو (پێویست) هێوریان دەکاتەوە!!

4. ستایشی خودا لە قورئاندا:

نووسەر بە ستایشی خوداوەند پەستە، دانایەتیی ئەو نازو نیعمەتانەی سەرزەمین بۆ خوداوەند، لای نووسەر بە کارێکی دژەوانەیە لەگەڵ زانستو پێشکەوتنی مرۆڤدا، چونکە ئەو پێیوایە بەهۆی کۆمەڵێ پرسیاری نادیارەوە مرۆڤ ستایشی خودا دەکاتو نیعمەتەکانی بەهی خودا دەزانێت، لەکاتێکدا کە ئەمە هەڵەیەکی تەواوەو پڕاوپڕ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نووسەر خودا ناناسێت، بۆیە وەڕسە لەوەی ستایشو سوپاسی بکرێت، ئەو پرسیارانەی مرۆڤێکی ئاسایی وەك شوانو جوتیارو سەپانێك وەڕس دەکات بۆ دۆزینەوەی خوداوەند، ئەو پرسیارەیە کە بەمانایەکی قوڵتر فەیلەسوفێکی وەك (غەزالی) (فارابی) هەراسان دەکات بەدوای خوداشوناسیدا، نەك ئەو لێکدانەوە سادەو ساکارەی نووسەر خۆی پێفریوداوەو دەیەوێ خوێنەریشی پێ چەواشە بکات.

5. سوێند لە قورئاندا:

لەم برگەیەدا نووسەر شتێك دەڵێ کە تەواوی بێئاگایی ئەو سەبارەت بەم مەسەلەیە نیشان دەدات، نووسەر دەڵێ: "ئایینی ئیسلام لە سوێندخواردندا گۆڕانکارییەکی کردووە، ئەویش ئەوە بووە کە لە جیاتی سوێند خواردن بە بتەکانی سەردەمی جاهیلی، لە قورئاندا سوێند بەهەندێ دیاردەو شتی جۆراوجۆری دیکە دەخوات.." (ل164 ئایا قورئان...)، ئەوەی نووسەر لێی بێئاگایەو شتێکی بەڵگەنەویستە، لە ئیسلامدا، سوێند خواردن جگە لە (خواو قورئان) بەهەموو شتێکی تری قەدەغەکردووە، بەم پێیە نووسەر لەمەسەلە گرنگو زەقەکان بێئاگایە، سەبارەت بەخوداوەندیش، سوێند بەهەر دیاردەیەك دەخوات، ئەوە مەشیئەتو دەسەڵاتی خۆیەتی (لایسال عما یفعل)، ئەو (حیکمەت)انەش نووسەر باسی لێوەکردون، دوورن لەمانای سوێندی خوداوەند بەو دیاردانە، بۆ نموونە نووسەر دەیەوێ بزانێ بۆچی خودا سوێند بە هەنجیرو کێوی سینینو مرۆڤ دەخوات؟! بەدوای خاڵە هاوبەشەکانی مرۆڤو هەنجیردا دەگەڕێت!.

ئەمەیە عەقڵی ئەم نووسەرەی پێیوایە ڕوئیایەکی فەلسەفی نوێی هێناوەتە کایەوە، ئەگەر کەمێك خۆی ماندوو بکاو گوتەی یەکێك لە ڕاڤەکەرانی قورئان بخوێنێتەوە ئاڵۆزیی ئەو پرسیارەی بۆ دەردەکەوێت.

پاشان لە چەند باسێکی دیکەدا، باس لە ناکۆکی و زمانی بێگانە دەکات لە قورئاندا، کە بەڕاستی سادەنو دووبارەن، بە پێویستی نازانم وەڵامیان بدەمەوە.

لە کۆتایی ئەم کۆتابەشەدا نووسەر لەبەردەم گەورەیی قورئاندا دەوەستێت و بەناچاری دەڵێت: "باسکردنی تێبینی و سەرنج لەسەر شێوەو ناوەرۆکی قورئان بە هەڵسەنگاندنی هەموو سەردەمەکان، هیچ لەگرنگیی قورئان، وەك دەقێکی مێژوویی کەم ناکەنەوە.." (ل194ئایا قورئان...).

پێموایە کە نووسەر ویستوویەتی لە کۆتاییدا ویژدانی خۆی ئاسوودە بکات بە وتنی ئەو دەقە، هەرچەندە بەدگومانم لەوەش ئەو ڕستانەش هی ئەوبن، چونکە کەسێك ئەو ڕستەیە دەڵێت، پڕاوپڕ بەشێك لە ژیانی خۆی لە خوێندنەوەو شیتەڵکردنی مانای دەقەکانی قورئاندا سەرف کردبێت، بێگومان کە نووسەری کتێبی (ئایا قورئان ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆیەتی) هیچ یەکێك لەو مەرجانەی تێدا نییە.

بۆیە بەنائومێدیەوە دەڵێم، ئێمە لەبەردەم کەسێکداین، نووسەرێکی جیددی نییە، ئاگای لە قورئان و فەرموودەو مێژوو نییە، بەڵام وەستایە لەوەرگرتنی پەرەگرافی ئەم نووسەرو ئەو نووسەردا، ئەمێنێتەوە ڕای خوێنەر، نازانم بەچ نرخێك ئەم کاڵایە لەم (پێویست)ە خوازراوە وەردەگرێت؟.

من بۆ خۆم، قسەی خۆم ڕاشکاوانەو بێناوی خوازراو کرد، بڕیاری تۆی خوێنەریش لای خۆتە.

**ناوەڕۆك** (ژمارەی لاپەڕەکان بە پێی کتێبە چاپکراوەکە)